لەناوچوونی گرانێ و دژوارێ کارێك ، بە جۆرێك پێکهاتن و جێبەجێبوون و چارەکردنی زەحمەتێ تێدا نەمێنێ . :: لەوەتێ پەنسیلین پەیدابوە چارەی فەڕەنگیش ئاسان بوە .

**ئاسانسۆر** – [ فرەنسێ ] ئامرازێکە لە خانوبەرە بەرزەکاندا شوێنی تایبەتێ بۆ دەکەن و لە نهۆمێکرا بۆ نهۆمێکی تر لە بالێ پلێکان پێی سەردەکەون یا دێنەخوار.

**ئاسان‌کردن** – [مصت. مت. ] لەناوبردن و لادانی دژوارێ و گیروگرفت لە سەر ڕێگای کارێك . :: قامۆس تەرجەمە ئاسان دەکا .

**ئاسانە** – (نت.)، (سن. ، هو.) تم : ئاستانە .

□ « من شەوێ نالەم
جۆش ئاوەردە بۆ »
« سەگی ئاسانەت
بێدار کەردە بۆ »
( مەولەوێ : مکب – ٦)

**ئاسانێ** – [ په : ئاسانیە ] ، ( حمص. ) چلۆنایەتێ کار یا قسە و باس و مەوزوعێك ، کە پیاو بتوانێ بە بێ زەحمەت و خۆماندوکردن بێکا یان تێی بگا. :: بە ئاسانێ وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە، ئوتومبێلەکەمان بە ئاسانێ لە چاڵەکە هێنایەدەر . ★ هاسانێ ، (بک.) سانایێ ، ساناهێ .

**ئاسایشت** – [ په : ئاسایشن]، (نمص.) ١– تم : حەسانەوە . ٢– هێمنێ و ئارامێ ، بێ قرە و بزەیێ :: پاتشام بە سلامەت دنیا ئەمن و ئاسایشە . ، ئەم منداڵانە ئاسایشیان لەم ماڵە هەڵگرتوە . تێب – ١– پیتی (ت)ی دوایێ ئەم ووشەیە لە قسەکردنا لەبەر قورسێ دەکەوێ یان بە حاڵ دەنگی دەردەکەوێ . ٢– مەصدەری ئەم ووشەیە کە لە زمانی کوردیدا بۆتە ( حەسانەوە ) ، ئەم ( نمص.)ە و ( نمف. )ی ئاسوودە و ( حمص. )ی ئاسانێ و (ص.)ی ئاسانی لەپاش بە جێماوە، لەفارسێشدا دوو مەصدەری ( ئاسایێدەن ) و ( ئاسوودەن )ی هەیە.

**ئاسپایێ** – ( ص. ) تم : ئەسپایێ . **بە ئاسپایێ** : (بنت.) تم : بە ئەسپایێ .

**ئاست** – [ ؟ ] ، ( نا. ) ١– جێگا ، شوێن :: لە ئاستی خۆت دانیشە ، لە ئاستی خۆی نەبزوت ، دوێنێ هەر لەم ئاستە توشی نەرێمان بوین . ٢– ( مج.) بەرامبەر ، ڕوبەڕو ، لا ، بە نیسبەت :: لە ئاستی کاك پیرۆلی دڵت هیچ غایلە نەکا، پێرێ بە ئاستی ماڵی ئێوەدا تێپەڕین . ★ حاست ، عاست .

**ئاستانە** – [ ئاست + ٢– ئان/١ + ٥ – ئە/١] (نت.) ، (سن.) ١– پێشخانە ، کەوشکەن . ٢– (مج.) قاپێ گەورەماڵان ، دەرگای شێخ و مشایەخ و پیاوانی بەدین. ★ ئاسانە.

**ئاستەڕ** – [ په : ئاستەر] ، (نا.)، (مک.) ١– پارچەیەك قوماشە، لەدیوی ناوەوە بە کەوا و چاکەت و ئەو جۆرە شتانەوە دایئەدرون. ٢– تویژاڵێ ڕەنگە کە لە پێشدا دەیدەن لەو شتانەی بیانەوێ ڕەنگیان بکەن ، وەك دەرك و پەنجەرە و دار و دیوار ،

پاش ووشك‌بوونه‌وه‌ی ده‌ستێكی تر ره‌نگی خه‌ستی لێ‌ئه‌ده‌ن . ★ (سنه.) ئاسه‌ڕ . ئه‌سته‌ڕ ، به‌ر .

**ئاستەم ـ** [ په : سته‌همه‌ك.] ، [ ئا + ستەم ] ، (نت.) (مكـ.) تم : به ئاسته‌م . ★ حاسته‌م ، عاسته‌م.

**بەئاستەم :** (بنت.) میقدارێكی كه‌م مه‌ودایێكی كورت ، مه‌سافه‌ی زۆر كه‌م ، تۆزیك ، نه‌ختێك . :: به ئاسته‌مێكی مابۆ بەر ئوتۆمبێل بكه‌وێ، به ئاسته‌م له به‌ری هه‌ڵستا ، به ئاسته‌م و دوو بەلا قوپاوه . هـس : ئه‌سته‌م ، سته‌م .

**ئاسك ـ** [ ست : ئاسو ] ، (نـا.) ١ـ گیاندارێكه كاوێژ ده‌كا ، ده‌ست و قاچی باریك و درێژن، چاوی ڕه‌ش و جوانه ، خێرا ڕاكردنی به ناوبانگه ، گۆشتی ناسك و خۆشه . ٢ـ (مجـ.) خێرا ، تیژڕۆ ، خۆشبه‌ز :: ئه‌سپه‌كه‌ی شامار ده‌ڵه‌ی ئاسكه ، حه‌مه‌مین برۆسكه هێنده خێرایه هه‌ر ده‌ڵه‌ی ئاسكه. **تێبـ ـ** ئه‌م ووشه‌یه له (ئاسو)ی ئاوێستایی به مه‌عنای خێرا و چاپوك كه‌وتۆته‌وه . **ئاسكۆڵ** [ ئاسك + ئۆڵ ] (نت.) ناوه بۆ كچان ( = ئاسكی پچوك ) ★ (جنـ.) ئاسی. جه‌یران ، خه‌زاڵ .

**ئاسمان ـ** [ ست : ئه‌سمه‌ن ، په : ئاسمان ] ، ( نـا.) ١ـ ئه‌و شتینایێیه پان و به‌رینه و بێ بن و بناوانه‌ی كه له ژۆر سه‌رانه و مانگ و ڕۆژ و ئه‌ستێره‌كانی تێدا ده‌خولێنه‌وه یا ڕاوه‌ستاون . :: پچێته به‌ڕبه‌ڕۆچكه‌ی ئاسمانێ ده‌یهێنمه خوارێ .

□ « وه‌ك شێفه‌له‌ته چۆن
نه‌بم له‌ت له‌ت »
«ئاسمان به‌رز و ده‌سا
زه‌وی سه‌خت »
( سه‌لام ـ ١٧٦ )

٢ـ جێگای پیاوچاكان :: عێسا چو بۆ ئاسمانان ، مه‌لایێكه‌ت له ئاسمانان هاتنه خوار. ★ عاسمان ، ( بكـ. ) ئه‌زمان ، ئه‌زمێن ، عه‌سمان ، (زازا) ئاسمیه ( تم : ژابا ـ ١٠). **ئاسمان و ڕێسمان** ( صت.) ١ـ نارێك ، ناله‌بار. ٢ـ قسه ، كار یا شتێ سه‌روبنی پێكه‌وه نه نوسێ . ٣ـ وه‌لامێك پێوه‌ندی به پرسیاره‌وه نه‌بێ . ٤ـ حالی دوو شتی جیاواز له یه‌كتر :: ئه‌م فه‌رمایشتانه‌ی ئێوه ، وه ئاسمان و ڕێسمان ده‌چن . جوابێكی دایه‌وه ئاسمان و ڕێسمانێش نه‌بو ، قسه‌ی وای ده‌كرد ئاسمان و ڕێسمانی چێ ؟

□ « به حاته‌م گه‌ر بكه‌ی ته‌شبیهی
ئه‌م ئاغایه بێ عه‌قڵێ »
« كه فه‌رقی ئه‌م له‌گه‌ڵ ئه‌و
ئاسمان و ڕێسمانی بۆ »

(ره‌زا ـ ٣٣) **چۆن به ئاسمانا :** (كنـ.) ١ـ خێرا و گورج و گۆڵ و به تۆڕه‌یی، له حاڵی دانیشتنه‌وه هه‌ستانه سه‌رپێ. ٢ـ زۆر تۆڕه بوون و ئه‌رز به خۆوه نه‌گرتن ، له شوێنی خۆ جوله جوڵ و گوڕه‌گوڕ كردن :: هه‌ر گوێی له قسه‌كان بۆ وه‌ك فیتشه‌كه شێته چو به ئاسمانا .

**ئاسمانه ـ** [ ئاسمان + ه ـ ئه

/١ ] ، (نت.) ، (سن.) میچی خانوو .
**ئاسمانەی دەم** : (نت.) ، (سن.) تە : مەلاشوو .

**ئاسمانیی** ـ [ ئاسمان + ٣ـ ئیی ] ، (صت.) ڕەنگی وەك ڕەنگی ئاسمان ، شینێکی کاڵ . ★ عاسمانیی .

**ئاسن** ـ ( نا. ) مەعدەنێکی کەوەڕەنگە لە زۆر سەنعاتەکانی ئەم زەمانەدا دە کار دەکرێ ، ئادەمیزاد لە زۆر کۆنەوە (٣٠٠٠ ساڵ پێش عیسا ، لە ئوور جنوبی عێراق ) ئاسنی ناسیوە و دۆزینەوەی کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ژیانی کۆمەلایەتیی و شارستانێتیی و بەرەو پێشی ڕاداوە . ئاسن بە خالیسیی لە کانا دەست ناکەوێ و لە شکلی چەند جۆرە ( بەرد ) دایە کە لە کوورەی زۆر گەرمدا ئاسنەکەیان لێ جیائەکەنەوە . ئاسنی خالیس لە ٨٠٠ دەرەجە گەرمایێدا سوور دەبێتەوە و نەرم دەبیّ ، لە ١٥٣٠ دەرەجەشدا دەتوێتەوە ، کارەبا بە هاسانیی بە ئاسندا تێدەپەڕێ و دەیکاتە ( میقناتیس ) ، لە هەوای نمدارا زۆر زوو ژەنگ هەڵدێنێ و دەڕزێ ، جا بۆ ئەوەی ( شە ) نەیڕزێنیّ ، ماددەیێکی تری ژەنگ نەهێنیّ تێهەڵدەسوون ، ئەو ڕەنگە سوورەی بە شێلمانانەوە دەیبینین بۆ ئەوەیە . ★ (بکـ.) هاسن ، هەسن ، حەسن ( تمـ : کفـ ـ ٣٤٤ ) تێبـ ـ ١ـ پۆرداوود ئاوێستایی ئەم وشەیەی بە (ئەیەنگە) داناوە (یکـد : جـ٢ ، لـ٨٦) و ژابا بە ( هەئۆسەفنە ) (تە : ژابا ـ ٤٣٩) هەر ژابا خۆی بە تەنیشت وشە ئاوێستاییکەوە پرسەکێکی ( ؟ ) داناوە . دوکتۆر معین لە زمان « بار تۆلە »ڕا (ئەیەهـ) دەگێڕێتەوە ( تە : بورهان ، جـ١ ، لـ٧٠ ) بە لای منەوە ئەوەی پۆرداود نیزیکترە لە ڕاستیی . ئەگەرچیی من وای بۆ دەچم کە ( ئەسەنگهە ) بە مانای « بەرد » ئەم وشە ئاوێستاییە بیّ کە ( ئاسن ) و (سەنگ)ی لیّ کەوتبێتەوە . پەهلەوییەکەی بە ڕای زۆران هەر ( ئاسن )ە ٢ . ( دەنگی ( س ) لە وشەی ئاسن و لك و پۆپەکانیدا (س)ی تەواو نیە بەلکو دەنگێکە لە نێوان ( س )ی کوردیی و (ص) عەرەبیی ، پێویستی بە لێکۆلینەوە هەیە . **ئاسنیسارد کوتان**ـ(کن.) کاری بیّ نەتیجەکردن، چونکو هەتا سوورنەکرێتەوە چەکوچ کاری لیّناکا .

**ئاسنجاو** ـ [ ؟ ] ، (نتـ.) ، قاپ و قاچاغی مس و زەرد یا هەر مەعدەنێکیتر کە لە ماڵێکا هەبیّ :: ئاسنجاوی ئەم ماڵە باری ئێستریکە . ★ (هل.) هێربار .

**ئاسنگەر** ـ [ ئاسن + گەر ] ، [ پە : ئاسنکەر ] ، (نت. ، صت.) ئەو کەسەی ئاسن لە کوورەدا سووردەکاتەوە و دەیکوتیّ و ئامرازی جۆر بە جۆری ( گاسن ، پێمەڕە ، ناڵ ... ) لیّ دروست دەکا . :: وەستا سمایلی فەرهادی ئاسنگەرێکی باش بوو ، هۆ کابرای

ئاسنکەر تا ئێرە وەرە . ★ ئاهینکەر
(بک.) هاسنکەر (ژابا ــ ٤٣٩) ،
هاسنکەر (کف ــ ٣٠٠) .

**ئاسنگەری** ــ ( حمص...... )
١ــ پێشە و کاری ئاسنگەر
٢ــ (کن.) تەقە تەقی زۆر .
:: منداڵینە ئەوە چیە دەڵەی
ئاسنگەری دەکەن .

**ئاسنەواڵە** ــ [ئاسن + ە ←ئە/١ + واڵە ؟ ] ، (نت.) تەل و بزمار و
لەت و پەتی مەکینە شکاو ، هەر
شتێکی تریش کە لە مەعدەن
دروست کرابێ و بێ کەڵك بۆ بێ .
:: ئەم هەموو ئاسنە واڵەیە چیە
لێرە کۆت کردۆتەوە . ( عا. )
قراضە .

**ئاسنین** ــ [ ئاسن + ئین ] ،
(صت.) هەر شتێکی لە ئاسن
دروست کرابێ. :: کاڵە و کۆچانی
ئاسنین . ئەسپەئاسنینە .

**ئاس و پەلاس** ــ [ ئاس
( = پە : بەرد ) + پەلاس (کوێن) ] ،
(کن.) ڕووت و قووت ، نەدار و
پەرێشان ● «ئاس و پەلاس ئازا
لەوەندەی » : سوێند بە ئاس و
پەلاس (ڕووت و قووتی) هیچ ، « بە
ئاس و پەلاسدا چوو کوتی ئاگام
لێ‌نیە » : سوێندی خوارد ( بە
ڕووت و ڕەجاڵی خۆی ) کە ئاگای
لە فلانە کار یا شت نیە . تێب ــ
مەبەست ئەوەیە هێندە ڕووت و
نەدارە بەرد (ئاس) سەرین و کوێن
( پەلاس ) ڕایەخ و پێخەفێتی .

**ئاسۆ** ــ [نا.] ١ــ ئەو شوێنەیە
کە وا دێتە بەر چاوان ئاسمان
لەوێ بڕاوەتەوە و بە زەوییەوە
نوساوە و لە دوای ئەوەوە چاوی
ئینسان هەتەر ناکا . :: مانگ
سەری لە ئاسۆ هێنایە دەر .
٢ــ (مج.) مەیدان و بەرینایی کار و
چالاکی ، لە هەموو بابەتێك .
:: ئاسۆی زانین و تێگەیشتنی
ئادەمیزاد هەروا بەرز ئەبێتەوە ،
ئاسۆی سیاسی ڕۆژهەڵات تاریکە .
٣ــ (مج.) سنووری دوو چلۆنایەتی
کۆمەڵایەتی . :: ئازادی و
بەختەوەری نەتەوەی کورد وا لە
پشت ئاسۆی برایەتی کورد و
عەرەب . ٤ــ ناوە بۆ کوڕان .
تێب ــ مانای ٢و٣ تازە داتاشراون و
زیاتر لە نووسینی سیاسیدا
بە کاردێن . ★ ئاسۆگ .

**ئاسۆگ** ــ [ ئاسۆ + گە ] ،
(نت.) ، (مک.) تم : ئاسۆ .

**ئاسوودە** ــ ( صمف..... )
١ــ حەساوەوە . ٢ــ بێ خەم و
خەفەت . ٣ــ بێ قرە و بڕە ، بێ
جموجۆل ، ئارام و بێدەنگ .
٤ــ بێ گیروگرفت ، دوور لە
ناڕەحەتی . :: چایەکی خواردەوە و
جگەرەیێکی کێشا ئاسوودە بوو ، تا
چاوی پێ نەکەوت دڵی ئاسوودە
نەبوو ، خۆزگەم بە خۆی کە
منداڵی نیە چا نیە ئاسوودەیە ،
منداڵینە ئاسوودە دانیشن ، چابوو
مرد بۆ خۆی ئاسوودە بوو . تم :
ئاسابیشت .

**ئاسوودەبوون** ــ (مصت. لا.) ١ــ
لە کۆڵ بوونەوەی گیروگرفت . ٢ــ
ماندووحەسانەوە .

**ئاسۆدەکردن ـ** (مصت. مت.) ١ـ گیرو گرفت لە کۆڵ یەکێك کردنەوە. ٢ـ بارسوك کردن و حەساندنەوەی ( ماددی و مەعنەوی ) کەسێك . ٣ـ ( کن. ) کوشتن و لە ناوبـردن :: بیبەن ئاسۆدەی کەن (بیکوژن) .

**ئاسۆدەیی ـ** [ ئاسۆدە + ٢ـ ئی ] ، ( حمص. ) ١ـ حالەتی بـێ گیروگرفتی . ٢ـ سەر سـوکی و بێ قرە و بزەیی . ٣ـ ئارامی و بێ شەڕ و شۆری .

**ئـاسەڕ ـ** ( نا. ) ، ( سن. ) تە : ئاسـتەڕ .

**ئاسەوار ـ** [ ؟ ] ، ( نت. ) ، (مک.) نیشانەیێکی ماددی کە لە کەسێ ، خێزانێ ، عەشیرەتێ یا نەتەوەیێك و گیاندارانی تر دەمێنێتەوە و بەڵگەی بۆنیانە . :: هەیهۆ ! چەند لە مێژە مردوە هەر ئاسەواریشی نەماوە ، گەلێك نەتەوە لە مێژوودا ناویان هەیە بەلام ئێستا ئاسەواریان بڕاوەتەوە . □ «کشە، کش !، ڕەببی ئاسەوارت بڕێ » ( ڕستەیێکە بۆ دەرکردنی مریشکان بە کاردێت ) .

**ئاسیا ـ** ( نا. ) یەکێکە لە پێنج ئیشکانییە گەورەکانی دنیـا ، بـە تەواوی لە بەشی (نیوەی بـاکوری) کورەی زەویدا هەڵکەوتـوە ، لـە هەمو ئیشکانییەکانی تر گەورە ترە و ٤٤ میلیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشە پانە و لە هەموانیش خەڵکی زۆر تر تێدایە . (١٩٠٠ میلیۆن کەس ، لە سـالی ١٩٦٩ ـ تـە : لاڕۆس ـ ١٠٤٢ ) .

**ئاسیاو ـ** [ پە : ئاسـیاپ ] ، [ ئاس ( لە ئەسانە : سـت = بەرد) + ١ـئی+ئاو]، (نت.) تە : ئـاش .

**ئاسیاوان ـ** [ ئاسیاو + وان ] ، ( صت. ) تە : ئاشەوان .

**ئاسێد ـ** (فرەنسی) ، (کئێر.) ، ( نا. ) تە : ئەسێد .

**ئاسێدە ـ** [= عا : عصیدة ] ، ( نا.) ، ( مکـ.) خواردەمەنییـەکی شیرنە لە ئـارد و ڕۆن و دۆشـاو دروست ئەکرێ. **تێبـ ـ** ١) ئاردەکە لە ڕۆنا سورئەکەنەوە و دۆشـاوی دەکەن بە سەرا ، لە سـەر ئـاگر دەمێنێتەوە تا باش تێکەڵاو دەبێ و پەیت دەبێتەوە . ٢) ئەم ووشـەیە لە موکوریان زیاتر لە ناو مەنگوڕان بـاوە .

**ئاسێو ـ** ( نا. ) ، ( سن. ) ئازار بەلا ، زیان .

**١ ـ ئـاش ـ** ( نـا. ) ١ـ دەزگایەکە ، گەنم ، جۆ و دانەوێلەی تری پێدەهاڕن و دەیکەن بە ئارد ، یا بۆ مەبەستێکی تر ووردی دەکەن. کۆنترین جۆری کە تا ئێستاش لـە کوردستان هەر ماوە ، ئاشی ئاوە کە دو بەرداشی خڕی هەیە لە سەر یەك دادەندرێن ، بەردەکەی بنـەوە ناجوڵێ و ئەوی سەرەوە بە زەبری ئاوێ کە بە تەووژم بە دۆڵاشدا دێتە خـوار و لە پەڕەی تەمبـورە دەدا دەسوڕێتەوە . ٢ـ ئەو شوێنە یـا ئەو خانوەی کە ئەم دەزگایەی تێدا دەنێنـەوە . ★ ئاسـیاو . ( زا.) ئاریش (تە: ژابا ـ ٥). **ئاش بەڕمێنە:** دان زۆر هـاتوە بۆ هـارین . // ئاش بەتـاڵ . **ئـاش بەری هاتوە :**

ئەوەندی هاڕیوە قوڵکەی ئاش پڕ
بوە لە ئارد. **ئاش دەکڕێ** : دان کەمتر
لە پێویست لە (کەوتێژە)وە دێتـە
خوار و بەرداشەکان لێك دەخشێن.
**ئاش دەمێژێ** : کونی بەرداشی
ژێرەوە کراوەتەوە و دانی پێدا
دەچێتە خوار . **ئاش فیتچقە دەکا** :
دولاش کونی تێبوە و ئاو بە تەوژم
لە کونەکەڕا دەردەپەڕێ . **ئاش
کەمەرە دەکا** : دان خاوە و لە باتێ
هاڕین و کردنی بە ئارد ، دەیجوێ و
قەڵت و بڕی دەکا . **ئاشی ئاگر** :
( نت.) مەکینەیەکە تازە داکەوتوە و
جێگای ئاشی ئاوی گرتوتەوە ،
بە ماتۆڕێکی تایبەتێ یا کارەبا
ئێش دەکا و هەموو ئەو ئێشانە
ڕادەپەڕێنێ کە جاران بە ئاشی ئاو
دەکرا . تێبـ ـ کاتێ ئەم مەکینەیە
هاتۆتە کوردستان خەڵك ناویان
لێناوە و ئەم ووشەیە پەیدابوە ★
ئاشی ئاوور ، ئاشی مەکینە .
**ئاشی ئاو** : ( نت.) جۆرە ئاشێکە لە
کوردستان باوە و بە ئاو دەگەڕێ ،
کە دەڵێن ( ئاش ) مەبەست ئەم
ئاشەیە . **ئاشی ئاوور** : ( نت.) تم :
ئاشی ئاگر . **ئاشی با** : ( نت.) جۆرە
ئاشێکە لە وولاتانی تر (زیاتر لە
ئەوروپا ) هەبوە و لە باتێ ئاو بە
( با ) گەڕاوە . **ئاشی قاوە** : ( نت .)
مەکینەیەکی بچوکە ١٥ ـ ٢٠
سانتیمەتر درێژێ و پانێ و بەرزایێ
دەبێ ، لە ماڵان ئاڵەت و بەهارات و
قاوەی بۆ دراو و ئەم جۆرە شتانەی
پێدەهاڕن ، بە دەست با دەدرێ .
**ئاشی کڕێوە** ـ ١ـ ( نت.) ، ( مک.)
ئـاشی زۆر خێرا ، ئـاشێکی
بەرداشەکانی خێرا بسوڕێنەوە ئارد
زۆر دروست بکا. ٢ـ (کن.) أ) خێرا
خێرا قسەکردن و نۆرەی کەس
نەدان :: ئەوە چییە دەڵەی ئاشی
کڕێوەی ، دە نۆرەی مەش بدە
با دوو قسە بکەین . ب ) زۆر بە پەلە
خواردن :: ماشەڵڵا حەسەن دەڵەی
ئاشی کڕێوەیە هێچی بۆ منداڵەکان
نەهێشتەوە . تێبـ ـ ئاشی کڕێوەی
ئاشێکی گەورەی ڕێكوپێك و بە
ناوبانگ بوە لە دێی (سەردەرابات)ی
نێزیکی ( مەهابات ) زۆر خێرا و
زۆری هاڕیوە ، لە کاتی گەڕانیا وەها
خێرا ئاردی فڕێداوە ڕۆری
ئاشەکەی پڕ کردوە لە تەپ و تۆزی
ئارد هەر وەك بەفر بباری و
(کڕێوە)ی بکا . جا ئەو ناوەیان
لێناوە و بۆتە کینایەش بۆ خێرایێ .
**ئاشی مەکینە** ـ (نت.) تم : ئاشی
ئاگر .

**٢ـ ئاش** ـ ( نا.) ، ( کك.)
چێشتێکی شلە ، لە گۆشت و
سەوزەیەك ( وەکو : بامێ ، باینجان
کولەکە و ... ) دروستدەکرێ و
دەگەڵ قبوڵێ و پلاو دەخورێ . ★
( سیم.) شلە . (کئێر.) خۆرشت.
٢ـ (سن.) هەموو چێشتێك . ٣ ـ
( کئێر.) چێشتێکە لە برنج و سەوزە
گیایەکی کولاو (پنگ ، جەعفەرێ ،
کەرەوز ، کەوەر ... هتد.)
دروستدەکرێ و ماست یا
دۆکەشکی خەستی تێکەڵ ئەکەن ،
ئەگەر وێستیان گۆشت یا جەرگ و
دڵیش ئەجنن و لەگەڵی دەیکوڵێنن

، جاروباره پیاز و ڕۆنیشی بە سەرا ئەکەن . تێبـ ــ ئەم ووشەیە بە ماتای سێیەمی لە فارسیڕا هـاتۆتە نـاو کوردیّ . ★ دۆکلیو .ـ هس ئـاز ( تە : ئازۆقە ) .

**ئاشاخە ( غە )** ــ [= تو : لای خوارەوە ] ، ( صـ.) ، (مک.) هەمۆ شتێکی خراپ و بێ‌کەلك .

□ « دیـسان بۆی تێنام لێفەی
ئاشــاخە »
لینگـی بە ملـم وێنــەی
دۆشـاخە »
[ ؟ ]

تێبـ ــ لە مەلبەندی سنە بە تایبەتیّ بۆ مێوەی گەنـدە و خراپ بە کـار دیت. ★ ( سنـ.) داشاخە .

**ئاشانە** ــ [ ١ــ ئاش + ئانە/٣]، ( نتـ. ) باجێکە ، ئاغا و دەرەبەگەکان لەو ناوچە و مەلبەندانەی ، خوردە مالیکییان تێداباوە ، لەو کەسانەی دەســتێنن کـە بـۆ خۆیــان ئاش‌دەنێنەوە و بە پێی زۆر و کەمیّ مزەی ئاشەکە دیاریّ‌دەکریّ .

**ئاشــبگێر** ــ [ ١ــ ئـاش + ب ( پێبـ. ) + گێر (گرتـن) ] ، ( نتـ. ) چۆنی چەتە و دز بۆ سەر ئـاش و گرتنی ئاشــەوان و بردنی گـەنم و دانەوێلە و هەرچیّ لە ئاشدا هەبیّ ، تالآن‌کردنی ئاش . هس : خانەبگێر.

**ئاش‌بەتاڵ** ــ ڕستەیێکە هـەر کاتیّ ئاش دانی نەمـا بۆ هـاڕین ، ئاشەوان بە دەنگـی بەرزی وەکـۆ هاوار دەیلیّ و خەلکی ئاگادار دەکا تا هەرکەس باراشی هەبیّ بێبا بـۆ هاڕین . **ئاش‌بەتاڵ‌کردن** ــ (مصـتـ. متـ.) ١ــ بانگــەوازی ئاشــەوان و ئاگادار کردنی خەلّك لە ئامـادەبیّ ئاش □ « ... ئاش‌بەتالی بۆ بکـە گەر تـاقەتی ... » ، (رەزا ــ ٧٥ ) ٢ــ ( کنـ.) واز لە کاریّ هێنان و بـە جیّ‌هێشتنی بە نیوە و نیوەچلـیّ :: هەر تـاقە ڕۆژیّ بە کـارەکەوە خەریك بۆن و ئاش‌بەتالیان لیّ‌کرد. تێبـ ــ ئەم مەعنایەی تەواو پێچەوانەی ( ئاش‌بەتالّ )ە کە هاواری ئاشەوانە و داوای ئیش دەکا ، کـەچیّ لێرەدا دەست لە ئیش‌هەلگرتن دەگەیێنیّ .

**ئاشپەز** ــ [ ٢ــ ئاش + پەز] ، ( نفا.) ( کنێر.)ژن یا پیـاویّ کـە پیشــەی چێشت‌لێنـان بیّ . ★ (هەکاریّ) ئازپێش . (بک.) ئـازچیّ ( تە : ژابا ــ ٧ ) . ( کەر.) ئاشچیّ، چێشتکەر .

**ئاشپەزخانە** ــ ( نتـ. ) ، (مک.) ئەو ژۆرەیە کە لە مالآن بۆ چێشت لێنان تەرخان دەکریّ و کەل‌وپـەلی چێشت‌لێنان و قاپ و قاچاغێتیشـی تێدادادەنریّ . ★ (سیمـ.) مۆبەق.

**ئاشپەزیّ** ــ ( ١ــ ئاش + پەز + ٢ــ ئــیّ ] ، ( حمصــــــ.) چێشت‌لێنان ، کـارێکی ئاشـپەز دەیکـا .

**ئاشت** ــ (صـ.) حالەتی نێوان دۆ یا چەند کەس ، دەستە ، بەرە و دەولەت کە ناخۆشیّ و ناکۆکیّ یـا شەڕ و کوشتاریان لە نێواندا نەبیّ. :: سۆســیالیزم و سەرمـایەداریّ ناتوانن پێکەوە ئاشت بن . ئێستـا ئەلمانیا و فەڕانسە ئاشتن .

**ئاشــتبۆنەوە** ــ (مصـتـ. لا. )

ڕێککەوتنەوەی دوو لا کە پێکەوە ناکۆکییان هەبێ :: ئەم ئاشتبوونەوەیانم بە کەیفێ بوو . لە خۆڕا دەنگیان لێك گۆڕێ بوو لە خۆشیانەوە ئاشتبوونەوە.

**ئاشتکردنەوە** — ( مصد. متـ.) ڕێکخستنەوە و پێکهێنانەوەی دوو یا چەند کەس ، دەستە و بەرە و خێزان و دەوڵەتان ، کە نێوانیان ناخۆش بێ ، دەنگیان پێکەوە نەبێ یا لە حالی شەڕدا بن . :: ئاشتمانکردنەوە . ئاشتکردنەوەیان باشە . هەر چۆنێ بوو ئاشتیانکردینەوە . ئەمریکا هەرچی دەکا عەرەب و ئیسرائیلی پێ ئاشت ناکرێتەوە .

**ئاشتی** — [ ست : ئاخشتی . ، پە : ئاشتیە ] ، (حمصـ.) ١ـ لە بیربردنەوە و لە بیرچوونەوەی ناخۆشی و ناکۆکی نێوان دوو کەس یا زیاتر . ٢ـ نەبوون ، نەمان و بڕانەوەی شەڕ و شۆڕ لە نێوان دەوڵەتان ، یا لە مەڵبەند و ناوچە و جێگایەکدا :: پاش تێکشکانی فاشیزم ، ئیمپریالیزمی ئەمریکا ئاشتی دنیای تێکداوە . ● «تەبەکی بڕ ئاشتی ماڵییە » ( کن.) تێری و تەسەلی بەری شەڕ و شۆڕ دەگرێ .

**ئاشتیخواز** — ( نفا.) ، ( تت.) ١ـ ئەو کەسەی حەز لە شەڕ ناکا . لایەنگیری ئاشتی ٢ـ ئەندامی ( ڕێکخراوی ئاشتی جیهانی ) کە لە پاش شەڕی دوەم دامەزراوە و دژی شەڕ خەبات دەکا .

**ئاشچی** — [ ٢ـ ئاش + چی ( ئە. فا.) ] ، [کو. تو.] ، ( نفا.) ، ( کمر.) تە : ئاشپەز .

**ئاشخانە** — [ ٢ـ ئاش + خانە]، ( نت.) ، (کمر.) دوکان یا هەر شوێنێکی دی کە چێشتی بۆ فرۆتن لێ حازر دەکەن ★ چێشتخانە ، ڕەستوران، لۆقەنتە، مەتعەم (عا.).

**ئاشرمە** — ( نا.) ، ( سنـ.) تەکەڵتوی زین ، نەرمەزین . تێبـ — مردۆخ ئەم ووشەیەی بەم جۆرە نووسیوە ( تە : ج ١ ، ل ـ ١٤ ) و دوکتور معینیش لە (فەرهەنگ : ج ١ ، ل ـ ٦٠ ) وەك ووشەیێکی فارسی هێناویەتی و ئاوای ساغکردۆتەوە : [ ئاذرم = ئادرمە = ئاترمە = ئاشورمە ] و گەلێ مەعناشی لێداوەتەوە . جا نازانم ( مردۆخ ) خۆی ئاسایێ ، بۆ نێزیك کردنەوە کوردی لە فارسی ئەم ووشەشی لە فارسیڕا هێناوە یاخۆ خەڵکی لادێ لە مەڵبەندی ( سنە ) بە کاری دێنن . بە لای منەوە ئەم ووشەیە زیاتر لە تورکی دەچێت تا کوردی و فارسی .

**ئاشفتە** — ( نمف.) ، ( سنـ.) ١ـ پەرێشان ، پەشۆکاو . ٢ـ شێواو ، ئالۆز ، تێکەڵ و پێکەڵ . □ « بەڵێ دز بازاڕ ئاشفتەی ئەوێ» ( تایەر هاشمی ) . هس : ئاشوب .

**ئاشق** — [= عا : عاشق ] ، ( نفا.) ١ـ پیاو یا ژنێ کە حەز لە ژن یا پیاوێك بکا . ★ دڵدار . □ « گەوهەرێ هەی گەوهەرێ ! ، گەوهەر مەڕۆ لە دواتم . گەوهەر وە قوڕئان قەسەم ئاشقی باڵاتم» . ٢ـ ( مکـ. ) گۆرانی بێژی

ئازربایەجانێ ، کە بە خۆی و (ڕۆبابە)
کەیەوە بە چاخانە و دێهاتدا
دەسوڕێتەوە و گۆرانێ دەڵێ . ★
شایەر .

**ئاشقەوماشقە** – [= عا :
عاشق و معشوق ] ، ( نت.) ١– دوّ
کەس کە حەز لە یەکتر بکەن . ٢–
( مجـ.) دوّ کەس کە دۆستایەتییان
زۆر گەرم بێ و هەمیشە پێکەوە
ببیندرێن :: ئەوە چییە ! ئەم دوانە
هەر دەڵەی ئاشقە و ماشقەن . ٣–
نێرە و مێیەی (مار) لە حالی
لێكهاڵانا :: ئەم کونە ئاشقە و
ماشقەیێکی تێدایە چەند جار
دێتۆیانن .

**ئاشکرا** – [ ستـ : ئاڤیشیە . و :
هەئیتهیە . – پهـ : ئاشکاراك. ] ،
( صـ.) چلۆنایەتێ کار ، مەسەلە یا
شتێك کە ئەوەندە ڕۆن و بێ گرێ و
گۆڵ بێ ، پیاو بە هاسانێ سەرە و
دەری لێ بکا و تێی بگا . :: ئاشکرایە
خوێندن باشە . وەك ڕۆژ ئاشکرا
بۆ ئەو کارە سەر ناگرێ . //
نهێنێ. تێب – پۆرداوود ئەم ووشەیە
دەباتەوە سەر ئەو ووشانەی لە
سەرەوە نیشانمان داون ( تە : پد.
یگد. ج ٢– ل ٣٣٧/١٢٠/٨٣ ) و
ژابا (تە : ل – ١١) هەر (ئاڤیشیە)ی
نۆسیوە مۆبەد فیرۆز آزەر
گوشەسب بۆ ئەم ووشەیە ووشەی
( ئەشکەرە )ی هێناوە و دەشنۆسێ:
« لە کوردیشدا ( ئاشکار ) دەڵێن»
(تە: بخشى از فرهنگ اوستا-٥١).

**بە ئاشکرا** – ( بنت.) ١– بێ پێچ و
پەنا . ٢– بێ دەڕۆ دامان . ٣– بە
دەنگی بەرز . ٤– بێ داپۆشین و
پەردەبەسەرنەدان . :: ئەمریکا بە
ئاشکرا شەڕ بە دنیا دەفرۆشێ . ●
« بانگی محەممەدی بە ئاشکرا
خۆشە » : کاری چاك نابێ
بشاردرێتەوە . «مانگا بە دزێ کەڵ
دەگرێ ، بە ئاشکرا دەزێ » : هیچ
شتێك تا سەر دە پەردەدا
نامێنێتەوە .

**ئاشکرابۆن** – [ مصتـ. لا.] ١–
دەرکەوتنی نهێنێ کارێك ، قسەیەك
یا مەسەلەیەك . ٢– لاچۆنی پەردە
لە سەر ئێشێکی نهێنی . ٣–
ڕۆنبۆنەوەی مەسەلەیەك . ::
ئیمڕۆش نەبێ سبەینێ هەر ئاشکرا
دەبێ . بەم کردەوەیان ئەوانی
پێشۆشیان لێ ئاشکرا بۆ . ئێستا
زۆر چاك ئاشکرا بوە دوژمنی میللەتی
کورد کێیە . **لێكئاشکرابۆن** –
[ لەیەك + ئاشکرابۆن] ، (مصتـ. لا.)
١– دەرکەوتنی حەقیقەتی دوّ کەس،
دوّ دەستە یا زیاتر بۆ یەکتر. :: هەر
شەبەقی دا ، دۆست و دوژمن
لێكئاشکرا دەبن . ٢– یەکتر
ناسینەوەی دوّ یا چەند کەسێ .
:: پاش ئەوەی تێك خوڕێن
لێكئاشکرا بۆن .

**ئاشکراکردن** – ( مصتـ. متـ. )
١– دەرخستنی نهێنێ کارێك ،
قسەیەك یا مەسەلەیەك لە لایەن
کەسێکەوە . ٢– داماڵینی پەردە
لە سەر کارێکی تا ئەو کاتە کەس
نەیزانیبێ . ٣– ڕۆنکردنەوەی
مەسەلەیەك :: کەس بە جێگای
چاپخانەکەی نەدەزانی خولە

ئاشكرای كرد . كەس ئاگای لەم كەین و بەینە نیە تۆ بۆچی ئاشكرای دەكەی . حوكمی زاتی مەسەلەی كوردی بۆ دنیا ئاشكرا كرد . **پێ‌ئاشكراكردن** ـ ( مصـ. مت. ) ئاشكراكردنی مەسەلەیێكە ، بە هۆی كەسێكەوە كە ئاگای لێ هەیە . جا بە هەوڵ و تەقەلا ، یا بە هەر شێوەیێكی تر بێ . :: بە زەبری تێلا ، دزێكەیان بە خەدر ئاشكرا كرد . هیتلەرێكان پارتیزانەكانیان سەرەوبن هەڵداوەسی ، هێشتا نەیاندەتوانی هیچیان پێ ئاشكراكەن .

**ئاشكرایی** ـ ( حمصـ. ) چلۆنایەتی شتێ یا كار و مەسەلەیێكی بێ گرێ و گۆڵ . سادەیی و ڕۆنی و بێ پێچ و پەنایی. :: ئاشكرایی لەمەە زیاتر ! كە خۆی پێی لێدەنێ . **بە ئاشكرایی** ـ (بند.) تم : بە ئاشكرا ( ئاشكرا ) . **ئاشكرایی‌لێ‌گوتن** ـ دەرخستنی نهێنی مەسەلە و كارێك ، كە دوو یا چەند كەس بیزانن ، لە لایەن یەكێك لە خۆیانەوە . :: ئاشكرایی لێ بلێ یا بە خۆیدا بشكێنەوە . ★ ڕاستی لێ گوتن . ئیعتیراف لە سەر كردن .

**ئاشگێڕ** ـ [ ١ـ ئاش + گێڕ ( گێڕان ) ] ، ( صفا.) ئەوەندە ( ئاو )ەیە كە ئاشێك دەخاتە گەڕ ، ئەویش بەندە بە گەورە و پچوكی و تەنكی و ئەستوری بەرداشی سەرەوە و ڕێژدی و نارێژدی دۆڵیانی ئاشەكەوە. :: جۆگەی ئەینال حەوت ئاشگێڕ ئاوی پێدا دێ .

**ئاشنا** ـ [ ستـ : ئاخشنا . پە : ئاشناك ] ، ( صـ.) ١ـ ناسیاو ، كەسێكی پیاو ناسیاوی دەگەڵی هەبێ ، بەڵام نەگەیشتبێتە ڕادەی دۆستایەتی . ٢ـ ( مك.) دوكاندار یا كاسبێكی كە پیاو هەمیشە كەلوپەلی پێویستی خۆی لەوێ بكڕێ ، یا پێچەوانەی ئەمە . ٣ـ ( مجـ. ) ، أ ) پێوەند ، مەیل . :: دەگەڵ نان و پەنیر ئاشنانیم . ب ) ، ( هو.) نێزیكی و ناسیاوی دەگەڵ جێگا و شوێنێك .

□ « چەم وە گەرد ڕای كێ ڕۆشنا بۆ » « لەب وە یاگەی پای كێ ئاشنا بۆ »

( مەولەوی : مكبـ ـ ٤٢٧ ) . ★ بێگانە، غەوارە . **ئاشنا پەیداكردن** ـ ( مصـ . تـ . ) تم : ئاشناگرتن ١ و ٢ . **ئاشناگرتن** ـ (مصـ. مت. ) ١ـ سەرەتای ناسیاوی‌و دۆستایەتی دەگەڵ كەسێ داخستن ٢ـ دوكاندارێك ڕەچاوكردن بۆ شت لێكڕین یا پێ فرۆشتن . :: وا دیارە تازە ئەم ئاشنایەت گرتوە ئاشنایەكی باشت گرتوە ، لە سەوداخۆشی دەچێ . **ئاشنا و ڕۆشنا** ـ [ ئاشنا + و + ڕۆشنا ( = ڕۆ + شناس ) ] كۆمەڵە ناسیاوی كەسێك ، هەموو ئەو كەسانەی كە یەكێك ناسیاوی دەگەڵیان هەیە. ::ئەم هەموو ئاشنا و ڕۆشنایەت لە كوێ بوو ؟ خدر ئاشنا و ڕۆشنای زۆرە. تێبـ . ڕۆشنا هەر وەكو نیشاندراوە ، بە لای منەوە

لە ( ڕۆ + شناس ) پێکهاتوە، یەعنی ئەوەی هەر بە ڕۆ دەناسرێ و دۆستایەتێکی ئەوتۆی دەگەڵ نەگیرابێ . ( ڕۆشنا ) بە تەنیا بە کارنەهاتوە .

**ئاش نانەوە** ــ [ ا ــ ئاش + نانەوە ] ، ( مصت . مت . ) ١ــ دروست‌کردنی ئاش :: پیرۆت وەستایەکی باشی هێناوە ئاشی پێ دەنێتەوە . مام گدرۆن خەریکی ئاش نانەوەیە . ٢ــ ( کن . ) سازکردنی گیرەوکێشە و گرفتاری بۆ کەسێ :: ئەم کابرایە ئاشێکی بۆ ناوینەوە هەرچێ دەکەین ڕزگاریمان نابێ .

**ئاشنایانە** ــ [ئاشنا + ئانە/١] ، ( صت . ، بنت . ) وەکو ناسیاو . بە شێوەی ناسیاوان . :: ئەم کارەتان لە ئاشنایانە نەدەچو . ئاشنایانە قسەیان دەگەڵ بکەن .

**ئاشنایەتی** ــ [ ئاشنا + ئەتی ] ، ( حمص . ) ١ــ پێوەندێ ناسیاوێ نێوان دوو یا چەند کەسێ. ٢ــ (مج.) ئیشتیبالێ‌بوون ، دڵ‌تێچوون ــ ( بۆخواردن ) ، عەلاقە ، پێوەندێ ( دەگەڵ شتێ ) :: پیرۆت ئاشنایەتی دەگەڵ دۆلمە خۆشە .

**ئاش‌وماش** ــ ( نت . ) ، (سیە.) ووتەیەکە منداڵان کاتێ قسە دەگەڵ یەك دەبڕنەوە ، دەیڵێن ، وەکو بیانەوێ بڵێن : هێچمان لە هێچ ، یا هەر کەسە لە ماڵی خۆی .

**ئاش وەستا** ــ ( نت . صت . ) ئەو کەسەیە دەزانێ ئاش بنێتەوە و ئەگەر خراپیش بو چاکی کاتەوە . :: مام ئۆمەر ئاش وەستایەکە وەکو خۆی نابێتەوە . مام خدری ئاش‌وەستا .

**ئاش‌وەستایی** ــ (حمص .)ئیشی ئاش‌وەستا . کاری نانەوەو چاکردنەوەی ئاش . :: ئەری کاکەسەنی دێبۆکرێ ئێستاش هەر ئاش‌وەستایی دەکا ؟ .

**١ــ ئاشو** ــ ( نا. ) ، ( سن . ) تە : ئاشوب .

**٢ــ ئاشو** ــ ( نا. ) (سن.) . هەوا و جەڕاحەتێ کە لە کوان و برینان‌دا کۆ دەبێتەوە ★ چلك . زوخ . زوخ . کێم . هەوا .

**ئاشوپاشو** ــ [ ؟ ] ، ( صت . ) ، ( سن . ) خەونی ئاڵۆز و ناخۆش :: هەر کەس شەو فرە بخوا ، خەوی ئاشوپاشو دەبینێ . ★ ( مک . ) هاتەران پاتەران . ( سن . ) هەڵیت پڵیت .

**ئاشوب** ــ ( نا . ) ١ــ ئاژاوە و پشێوی ٢ــ هەرا و هۆریا و حاڵەتی تێکچونی ئاسایشت . ٣ــ کاری بە گڕ یەکا چون و تێك بەربونی خەڵك.

□ « ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسەیی شاهن » « ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن »

( نالی : گە ــ ٣٤ ) ★ ئاژاوە . ( سن . ) ئاشو ، ئاشێو . پشێو نە ، پشێوە ، پشێوێ . هس : ( بک . ، ئاشێو = قازانجی نارەوا ( تە : ژابا ــ ١١ )

**ئاشوبگێڕ** ــ ( نفا . ) تە : ئاژاوەگێڕ .

**ئاشوبگێڕان** ــ (مصت . لا.) تە :

ئاژاوەگێڕان .

**ئاشۆبگێڕێ** ــ (حمص .) کارێکی پیاوی ئاشۆبگێڕ دەیکا . :: پیاوی چا بە واز لەم ئاشۆبگێڕییە بێنە .

**ئاشۆبنانەوە** ــ ( مصت . لا. ) تە : ئاژاوەنانەوە .

**ئاشەبەتەندۆرە** ــ [ نت . ] ، تە : ئاشەبەتەنۆرە .

**ئاشەبەتەندۆرێ** ــ [ نت . ] تە : ئاشەبەتەنۆرە .

**ئاشەبەتەنۆرە** ــ [ ١ــ ئاش + ٥ ــ ئە/١ + تەنۆر + ٥ ــ ئە/١ ] ، ( نت. ) ، ( سیە. ) یـارێیەکی کوردەوارێ منالانەی فولکلۆرییـە .

**تێبـ** ــ منالەکان دەبن بـە دۆ دەسـتە و مامۆسـتاکانیان لێـك ( دادێنن ) ، هەر لایەکیان تێکەوت ( دادەبێ ) : منالەکانی ئەم دەستەیە ( هەر چەندکەسێ بن ) لـە دەوری یەك ئالقە دەدەن و سەر بە سەری یەکـەوە دەنێن . منـدالـەکانی دەستەکەی تریش بـە دەوریـاندا هەڵدەخولێن و هەوڵ ئەدەن خـۆ باوێنە سەر پشتیان و هـەر کەس توانی (سواربێ) تا دەستەی تێکەوتۆ ( هەڵدەسـتێتەوە ) دانابـەزێ . مامۆستای دەستەی ( تێکەوتۆ )ش بە دەوری هاوڕێکانی خۆیدا سـۆڕ ئەخوا و دەیانپارێزێ تـا ئـەوانیتر نەتـوانن سـواریان بن . ئـەگەر مامۆستای دەستەی تێکـەوتۆ توانی دەست یا لاقی لەمنالێکی دەستەکەی تر بدا (پیسی‌کا) ئەوا ئەوجار ئەوان تێدەکـەون و دەسـتەکـەی تر هەڵدەستێتەوە. ★ ئاشەبەتەندۆرە. ئاشـەبەتەنـدۆرێ . ( سـنـ .) ئاشەتەنۆرێ . ( مک. ) کەری سۆری پشتدرێژ .

**ئاشەتەندۆرە** ــ [ ١ــ ئاش + ٥ ــ ئە/١ +تەندۆر+٥ــئە/١ ] ، (نت .) . (مک .) ئاشێکی (تەندۆرە)ی هەبێ ، ئاشێکی دۆلاشەکەی لە باتێ ئەوەی لە دار و تەختە ، یـان هەر جۆگەیێك بێ ، بـە بەرد و قسـڵ هەڵدەبەسترێ و لە دۆلاشـی دێکە زۆرتر دەچێتە سەر(تەمبۆ). ئەمەش بۆ ئەوەیە ئـاو بـە فێزۆ نـەچێ و کەمترێـش پێوێسـت بـێ بـۆ وەگەڕخستنی ئاش . ★ ( سیە . ) ئاشەتەنۆرە .

**ئاشەتەنۆرە** ــ ( نت .) ، (سیە.) تە : ئاشەتەندۆرە .

**ئاشەتەنۆرێ** ــ [ ١ــ ئـاش + ٥ ــ ئە/١ + تەنۆر + ٤ ــ ئێ/٢ ] ، (نت .) ، (سنـ .) تە : ئاشەبەتەنۆرە.

**ئاشەوان** ــ [ ١ــ ئاش + ٣ ــ ئە/٢ + وان ] ( نت . ) ئەو کەسەی لە سەر ئاش دادەنێشێ‌و چاوەدێرێ هاڕینی دان دەکا . ئەوەی ئیدارەی ئاشی بە دەستە . ★ ئاسیاوان . ( بک . ) ئاشڤان ، ئاشڤانچێ ( کف ــ ٥١ ) ، ( زا . ) ئارەوانچێ ( ژابا ــ ٦) قەڕاش (جخ : ج ٢ ، ل ــ ٢٣٢)، کەڕاش ( ژابا ــ ٣٢٨ ) .

**ئاشەوانێ** ــ [ ئاشەوان + ٢ ــ ئێ ] ، ( حمص . ) ئێشی ئاشەوان، لەسـەرئاش دانیشـتن و سەربەرشـتێ‌کردنی ئێـش و کـارەکانی . :: مام خدر حـەوت ساڵان لە دێی (خاتوخاس) ئاشەوانێ

کرد .

**ئاشێڕ** ــ [ ١ــ ئاش + هێڕ = هار ( هاڕین ) ] ( نفا . ) ئەو کەسەیە باراش دەباتە ئاشێ بۆ هاڕین .

**ئاغا** ــ [ = مەغۆلی : گەورە ، سەروەر ] ، ( نا . ) ١ــ لەقەبێکە بە دوای ناوی خاوەن ملك و سەرۆك عەشیرەتەکانەوە دەنـدرێ :: باپیراغای مەنگوڕ . حەمەداغای مامەش . بابەکراغای پژدەری . حەماغا ( حەمەداغا )ی کۆیە . شێخ محەممەداغای وەلاشی . حەمەداغای مێرگەسۆری . تێب ــ أ ) ئەگەر ئەم کەسە لەقەبێکی تری وەکو ( بەگ ) و ( خان )یشی هەبێ ، ( ئاغا ) کە دەخرێتە پێش ناوەکەی :: ئاغا مۆمن بەگی یەکشەوەی . ئاغاخەلیل‌خان . ئاغاحەمەدبەگ ب) لە هەندێ‌مەلبەندی کوردستان وەکو سەقز و سنە ، بێ ئەوەش هەر لە پێش ناو دادەندرێ :: ئاغاحەسەنی یازێبلاغی . ٢ــ بۆ ئیحتیڕام دەخرێتە پێش ناوی دەولەمەندەکانی ناو شاران . :: ئاغامیرزاڕەحمەتی شافیعی . ئاغا میرزا سالحی شاتری . ٣ــ (کئێر.) لە نامە بۆ نۆسین و قسە دەگەڵ یەکیکاکردن، بۆ ڕێزلێنان و حورمەت‌گرتن (ئیزافە) دەکرێتە سەر ناوەکەی . ئاغایی میرزا حوسێن ئاغایی زەڕگەری . تێب ــ ( أ ) لە قسەکردنا (ئاغا) کە کورت دەکرێتەوە و دەبێتە ( ئا ) تە : ( ە ــ ئا ) ب ) ئەم ووشەیە لە کوردستانی ئێران بە ( ق ) دەنۆسرێ : ئاقا ، چونکو ئەگەر بە ( غ ) بنۆسرێ لە فارسیدا مەعنای ( خواجەی خەسێنراو ) دەبەخشێ . ٣ــ بە نیشانەی گەورەیی و بە گەورەزانین دەخرێتە پێش ناوی ( سەید )ان :: ئاغاسەید جامی . ئاغاسەیدعەلی . ٤ــ داشێکی ( دامە )یە ، کە لەبەری یەکێك لە یاریکەرەکانەوە توانیبێتی بگاتە ڕێزی هەرە دوایی بەرەکەی تر و هەقی ئەوەی دەدرێتێ کە ئەوەندەی بەری بەرەللا بێ بڕوا ( چەند خان بە جارێك ببڕێ ) :: هەر وا زۆ ئاغات کرد . ئاغاکەم دێنمەوە بەری خۆم . ئاغاکەت دەدەمێ بیخۆ . ★ دامە .

**ئاغابانـۆ** ــ (نت.) ، (مکـ.) قوماشێکی لۆکەیە ، یا دێغ‌دێغی ڕەش و سپییە یا گوڵ‌گوڵ بە ئەندازەیێکی تایبەتی و چوارگۆشە دروست دەکرێ و پیاوان لە سەری دەبەستن ، لە هێندێك شوێن لە باتی ڕەش و سپی ، سۆر و سپی باوە . ★ جامانە ، جامانی ، جەمەدانە ، جەمەدانی . ٢ــ هەر ئەو قوماشەیە و تۆزێ باشترە ، بە ئەندازەی تایبەتی بڕبڕ نەکراوە و چەشنی قوماشی تر بە تۆپە ، ژنان دەیکەن بە کراس . ★ ئاغەبانۆ .

**ئاغاژن** ــ (نت.) ئافرەتێ ، کە ژنی سەرۆك عەشیرەت یا خاوەن ملك یا هەر کەسێکی تر بێ کە ( ئاغا )ی پێ بگوترێ :: ئاغاژن

ئایشێ ، ئاغاژن مرۆتە .

**ئاغاکردن** ـ ب [ مصت. مت. ] ، (مک.) گەیاندنی داشـێکی دامە لە بەرێـکەوە بـۆ ئاخـر ڕێـزەکانی ئەوبـەر ، کـردنی یەکێـــك لـە دارەکانی دامە بە ئاغا . :: هـەر ئێستا ئاغای لێـدەکەم . نەمزانی کوێڕا ئاغات کرد . ★ دامەکردن .

**ئاغایانە** ـ ( ئاغـا + ئانـە ) ١ـ (نتـ) باجێـکە ، دەرەبـەگ و خاوەنملك لـە ناوچەیـەكدا كـە خۆیان ملکیان تێـدا نەبێ بـەلام دەسـتیان بە سـەر مەلبەندەكەدا بڕوا ، لە جوتێـرەکان و خەلـکی لادێی دەسـتێنن . ٢ـ (صـت.) ئـەوەی لە ئاغـا دەوەشـێتەوە ، کارێکی بۆ ئەوە بێ بۆ ئاغا بکرێ یا هەر ئاغا بیکەن . :: ئەم فێز و ئیفادەی ئاغایانە بۆ تـۆ نەهاتوە . ڕاوێـکی ئاغایانـەمان کـرد . ٣ـ (بنـ.) بە شـێوەی ئاغایـان ، وەکـو گەورەپیـاوان ، وێنـەی جوامێـران . :: ئاغایانە وازمـان لێبێنە . ئاغایانە دانیشە .

**ئاغایەتی** ـ [ ئاغا + ئەتی ] ، (حمصـ.) ١ـ ملکـــداری ، سەرۆکایەتی عەشیرەتان :: ئاغایەتی لەم زەمانەدا باوی نەماوە . مـالی حەمەداغای چەنـد پشت ئاغایەتی مامەشانیان کردوە . ٢ـ چۆنێتی و بابەی ئاغا ، گەورەیی . :: ئاغایەتی هەر لـە خـۆی دەوەشـێتەوە ، ئاغایەتی کارێکی هـەر وا هاسان نیە . ★ ئاغایی .

**ئاغـایی** ـ [ ئاغـا + ئی ] تە : ئـاغایەتی .

**ئاغزۆنە** ـ [ ئـاغ ؟ + زۆنە = زوانـە ] ، (نتـ.) ئالقەیێـکە ، لە مەعدەن ، شاخ یـا ئێـسك و ئەو جۆرە شتانە ، بە شـکلی دایرە یا چوارگۆشـــە و .... دروسـت دەکرێ ، لە ناوەڕاستیا تێزمالکێکی لە عەینی ماددە پێدا ڕابەل کراوە . وەکو قوتری دایرە (تە : پردەلە) ، ئەمەشیان (زمانە)یێکی تێدەخرێ . ئـەم ئامـرازە دەخرێتـە سـەری پشـتێندی قـایش ، هەمیـان ، بەندەسەعات و فیشەکدان و گەلێ شتی لەم بابەتە و لە پشت یا هەر شـوێنێکی تر تونـد دەکرێ . ★ ئالقەزۆنـە ، ئاوزۆنـە . (بکـ.) ئاغزۆم ، ئاقزۆم ( ژابا ـ ١٥/١٢ ، کف ـ ٥٤/٤٢ ) .

**ئاغزە** ـ [ = تو + ئاغز : دەم ، زار + ە ـ ئە/١ ] ( سنـ. ، کمر. ) پارچـە کاغەزێکی بچکۆلـەیە ، لە سەرێکەوە کـۆل دەبڕن و لـولی دەدەن دەیخەنـــە بنـی قامێشـە جگەرەوە بـۆ ئەوەی کـە تۆتنیان تێکرد نەڕژێتە خـوار و لە وەختی کێشانی جگەرەشدا کاری دارجگەرە دەبێنێ . ★ بنك . بنکەجفارە . دەمە .

**ئاغسـتۆس** ـ [ = لاتینـی : ئۆگوستوس ] ، (نا.) تە : ٢ـ ئاب .

**ئاغلەب / بە** ـ [ محـر . عـا : اغلب ] ، (مکـ.) ، (صـ.) تە : ئەغلەب .

**ئاغە** ـ (نا.) ، (هل. ، سنـ. ) تە : ئاغـا . :: مـالی کاکەخـانی

ئاغەنە (ئاغان) .
**ئاغەبانۆ ــ** (نت.) تە : ئاغابانۆ .
**ئاغــەڵ ــ** (نـا.) ، (مکـ.)
١ــ ئەشکەوتی تەبیعی یا دەسکرد لە
کێو ، یا چاوە خانوێك لە ناوماڵ
کە بۆ داکردنی مەڕ و ماڵات تەرخان
دەکـرێ . ٢ــ چـوار دیوارێـکی
سـەردانەپۆشراو لـە دەشت ، بۆ
داکـردنی مـەڕ و مـاڵات . لـەو
شوێنانەی زۆر سارد نیە و بەفر ،
یا هەر نابارێ یاخـۆ نامێنێتەوە ،
هەم ناهێڵێ مـاڵات بە دەشتا بڵاو
بێتـەوە و هـەم بـای ساردی
زسـتانیش کەسـیرەیان نـاکا .
٣ــ جێـگایێکی تایبەتییـە ، لـەو
شوێنانـەی بەردیـان کەمـە بـۆ
داکردنی مەڕ و مـاڵات بە (چەپەر)
دەیکەن . ★ غەڵ .
**ئافات ــ** [= عا. جمی : آفت] ،
(نا.) بـەڵا ، زەرەر و زیـان ( بۆ
کشتوکاڵ ) ، نەگبەتێ . نەخۆشێ
( بۆ ئاژاڵ و پاتاڵ ) :: دەغڵەکەی
ماڵی مام خدرێ ئافـاتی زۆرە .
هــەرچێ حەیوانیشــیان هەبــۆ
ئەمساڵ ئافاتی گەیشتۆتێ .
□ « تاقانـە یەتیمـی خەڵــەفی
قەتـرەیی نیسـان »
« تۆ خۆش بی ، سـەدەف بۆ،
بەنیدات دۆربی لە ئـافات » .
( نالی : مقبل ــ ١٠ )
تێبـ ــ ئەم ووشە عەرەبییە ،
بە شێوەی ( جەمع ) هاتۆتە نـاو
زمانی کوردێ ، بـەڵام زیاتر وەك
( مفرد ) بەکاردێت .
**ئافاق ــ** [= عا. جمی : أفق] ،
(نا.) ١ــ تە : ئاسۆ .
□ « لە ئافاقی ژیـانی ناهومێدێم
خەندەکەی بـابی »
« فریشـتەی پـاکی هێوامی
نیشـاندام کە بیدوێنم »
( دڵدار ــ ٥٢ )
٢ــ دنیا .
□ « ئاخـر نـە ئافـاق سـەدای
عەشق ئەو »
« بـەرز بی چون خـوڕۆش ،
کۆس کەیخوسرەو »
( خانا ــ ٣٥٤ )
**ئافتا ــ** [ئاف = ٢ــ ئاو + تا] ،
(نت.) هاوتا ، هاوچەشن ، وێنە .
□ « ئەگەر چاوی خۆم بە پایەزێنێ
هەڵدێنـایە ئـەو خاتۆنـەم دێ و
ئافتـای کاکەمـــەمی جوانـە . »
( تحفە : ج ١ ــ ٢٢٦ ).
**ئافتاب ــ** [ فـر. ] ، (نـا.)
١ــ خۆر ، هەتـاو ٢ــ نـاوە بـۆ
ئافرەتان . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە
زمانی کوردیدا ، بە تەنیایێ هەر بە
مەعنای (٢) دەبینـدرێ ، بەڵام لە
تەرکیبدا ، ئەویش کەم ، هەیە .
★ ئافتاو .
**ئافتابگەردان ــ** [ ئافتـاب/١
+ گەردان = وەرگێڕ ] ، [فر. کو.]
(نت.) ، (مکـ.) پێشـچاوکەیەکە لە
چەرم یا مقەبا ــ بە شکڵی مانـگی
کەمتر لە حەوت شەوە ــ دروستی
دەکـەن و ئـەو سەرەوسەرەکەی
بەنێکی تێـدەخەن . لـە وەختـی
دروێنە یا کاری دێـکەی کشتوکاڵا
جۆتیاران لە ناوچاوانیانی دادەنێن و
لە پشتە سەریان گرێی دەدەن تا

تێشکی هەتاو لە دەم و چاویان نەدا .

**ئافتابپەڕ** ــ [ ئافتاب + پەڕ ( پەڕین = دوورکەوتنەوە ) ] ، [ فر. کو. ] ، (نت.) ڕۆژاوا ، تاوپەڕ .

☐ « تا وەخت غوروب وادەی ئافتابپەڕ »
« پەڕان تەر جە نەخش ، پەڕ دالْ گوڵزەڕ »

( خانا ــ ١٩٤ )

**ئافتاو** ــ [ ئاف + تاو ] ، (نت.) ، (سنە. ، سیمە. ، مکـ. ) ١ــ تە : ئافتاب /١ ☐ « سبحەینێ ئەگەر ئافتاو دەرپەڕیبە ، ماڵماڵ ئەوێ ڕۆژێ دەهاتە بازاڕیبە » (تحفە : جـ٢ ــ ١٦) ٢ــ تە : ئافتاب/٢ .

**ئافتاوپەڕ** ــ (نت.) تە : ئافتاب پەڕ .

☐ «چۆگە هەم خەرگەی خوسزەوی گوڵزەڕ»
« کەردشان وە پا وەخت ئافتاوپەڕ »

( خانا ــ ١٨٨ )

**ئافتاوە** ــ [ ئاف + تاو + ە ــ ە/١ ] ، (نت.) دەفرێکە ، لە تەنەکە ، مس ، زەرد یا وەرشەو دروست دەکرێ ، بۆ دەست و چاو شوشتن و دەستنوێژ هەڵگرتن بەکاردێت . ★ مەستینە .

**ئافتاوەدار** ــ [ئافتاوە + دار ]، (نت.) خزمەتکارێکی لە دیوەخانی میران و ئاغایان و دەربارەی پاتشایان ، بۆ هەڵگرتنی ئافتاوە و ئاو بە دەستی خەڵکداکردن ، تەرخان کرابۆ .

☐ « من کەمتەر کەنیز پەرستار تۆم »
« من ئافتاوەدار ، خزمەتکار تۆم »

( خانا ــ ٢١٩ )

**ئافتاوە و لەگەن** ــ ئافتاوە و قاپێکی دیکەیە لەعەینی مەعدەن ( لەگەن ) کە دەستی لە سەر دەشۆرێ ، بۆ ئەوەی ئاوەکە نەڕژێتە سەر ئەرز یا فەڕشان :: دەستێك ئافتاوە و لەگەنی مسواری جوانیان هەبۆ .

**ئافتۆمات** ــ (نا.) ، ( کتێر. ) جۆرێك چەکی شەڕە ، لە تفەنگ بچووکترە و لە دەمانچە گەورەتر ، بۆ هەڵگرتن سووکە و فیشەك زۆر دەخوا ، هەر جارێك میتلی ڕاکێشرێ ئیتر پێویستی بەوە نیە پاش تەقاندنی هەر فیشەکێك ــ وەکو تفەنگی تر ــ جارێکی تر میتلی ڕاکێشن و فیشەکی بەرنەبەر. هێندێکیان بۆ تەقاندن دەرەجەیان هەیە ، یەك یەك ، یان دوو دوو ، یان هەرچی فیشەکی تێیدابێ هەمووی بە جارێك دەردەکا . کلاشینکۆف و ستێن ئافتۆماتن . تێب ــ ئەم وشەیە هەر عەینی وشەی ( ئۆتۆمات )ی فەرەنسییە کە لە ( ئۆتۆماتۆس )ی یۆنانی وەرگیراوە و مەعنای ئەوەیە : ( لە خۆیەوە کار دەکا ، لە خۆیەوە دەبزوێ ) . لە شەڕی دوەمدا کاتێ ( ئوردووی سوور ) هاتۆتە کوردستانی ئێران ئەم وشەیەش بە شێوەی ڕووسییەکەی

هاتۆتـه نـاو زمـانی کـوردیّ
★ تەماتیر ، تەماتیك (کمر.)
تۆمیکەن . هس : ئافتاب ، ئافتاو
بە مەعنای : لە خۆیەوە دەدرەوشیّ
یا لە خۆیەوە گەرم .
**ئافراندن** ـ [ ست : ١ـ فرا ،
ئومریّس . ٢ـ فرا ، کەریّت .
پە : ئافریّتەن ] ، (مصد. مت.) ،
(بک.) دروستکردن ، داهیّنان ،
خەلق‌کردن ( تە : ژابا ـ ١٣ )
داتاشین . تیّب ـ دوّ ڕیّشەکەی
ئاویستایی یەکەمیان بۆ ئەو شتە
چاك و بەکەڵکانەیە کە (ئاهۆرامەزدا)
خەلقیان دەکا و دوّهەمیش بۆ شتی
خراپ و بێ‌خێر کە ( ئەهریمەن )
دایان‌دێنیّ . ( تە : پد. یەسنە .
جا ـ ٢٤٣ ) .
**ئافرّ** ـ (نا.) ، (زا. ، هو.)
تە : ئاخورّ .
**ئافرەت** ـ (نا.) ١ـ جسنی
مێبینەی ئادەمیزاد . ژن ::
ئافرەتێکی چاکە ( ژنێکی چاکە ) .
٢ـ هەندێ پیاو کە ناوی ژنی
خۆیان نابەن بەم وشەیە بانگی
دەکەن :: ئافرەت چێمان هەیە بۆ
نێوەڕۆ . ★ عافرەت . هس :
(١) ئافرودیزیاك ( ئینگلیسی ،
فرەنسی ) = ئەو دەرمانانەی کە
توانایی جوت‌بوون زیاد دەکەن و لە
( ئافرۆدیت )ی یۆنانی وەرگیراوە
کە بە خوای جوانی و دلداریّ
مەشهورە و لای ڕۆمانیەکان بۆتە
ڤینۆس . (٢) عەوڕەت ، عفریت .
(عا.) .
**ئافەریدە** ـ [ پە : ئافریتەك ] ،
( نمف.) خەلق کراو ، دروست کراو،
مەخلوق :: هەموّمان ئافەریدەی
خودایەکین ، هیچ ئافدریدەی
خولای بە حالّی جوامیّر نەبیّ .
تیّب ـ ئەم وشەیە لە قالّبی ئیسمی
مەفعولدا لە ( موکوریان ) و
( سلەیمانیّ ) و ( سنە ) بەکاردیّت ،
بەلاّم مەصدەرەکەی لە بیر چۆتەوە و
بە هۆی فیعلی موساعیدی (کردن)
مەصدەریّکی تیّکەلّی لیّ
دروست‌کراوە ، بەلاّم لە لەهجەی
باکوریدا ( ئافراندن ) ( تە : ـ )
هەیە .
**ئافەریدە کردن** ـ (مصت. مت.)
لە نەبوونەوە دروست‌کردنی شتیك .
داهیّنان . خەلق‌کردن . □ « بەو
خودایەی هەموّمانی
ئافەریدەکردوە . » .
**ئافەریم** ـ ( نا.) ، (مک.) تە :
ئافەریّن .
**ئافەریّن** ـ [ ست : ئافرینە،
ئافریڤەنە . پە : ئافریّن ] ، (ئە.)
بەمانای : زۆر چاکە ، باشە ،
پەسندە ، باشت‌کرد و بۆ ئەم
مەبەستانە بەکاردیّ : ١ـ یەکیّك
کاریّکی کردبیّ و بە لای یەکیّك یا
چەند کەسیّکی ترەوە باشی کردبیّ ،
بۆ دەربڕینی ڕازیّ‌بوونی خۆیان و
هاندانی و دلخۆش‌کردنی ئەو ،
پێی دەلّیّن ئافەریّن . ٢ـ لە ئیّران
قوتابیّکی ئەرکەکانی بە چاکیّ و
ڕیّك‌وپیّکی جیّ‌بەجیّ بکا ، ماموّستای
لەسەر دەفتەرەکەی بۆی دەنوسیّ
ئافەریّن . ٣ـ بۆ دەربڕینی ناڕازیّتیّ
لە کردەوە و ڕەفتاری کەسیّ یا لە

کـارێکی کردوێـــە ، بە ڕاوێـــژی سـەرسوڕمانەوە دەکوترێ . :: هەی ئافەرین ! بۆ کاریٚ‌کردت ، هەزار ئافەرین ! بۆ ئەم ئازایەتییە . ٢ــ ناوە بۆ ئافرەتان ★ ئافەریم . // نەفرین ( = نەئافەرین ) .

**ئافەرین لێکردن** ــ ( مصـد. مت.) بە کەسـێ ووتـن ئـافەرین . :: ئێشەکەی ئەوەندە بە ڕێ و جێ بۆ هەمو بە جارێك ئافەرینیان لێکرد.

**ئاقـار** ــ [ ؟ ] ، ( نا.) ، (مکـ. سـنـ. ) دەوروبـەر ، نێزیکـان ، جێگەوشوێن :: لەوان ئاقارانە . لە ئاقاری ماڵی خۆیـان ، لە ئاقـاری ( چوارتا ) تۆشی کاروانەکە بۆین . هس : ( عا.) عقار .

**ئاقڵ** ــ [ = عا : عقل ] ، (نا.)، (مکـ.) ١ــ هۆش، فام ، تێگەیشتن :: ڕۆڵە ئـاقڵت‌بێ. ٢ــ [= عـا : عاقل]★ئەقل. ٢ــ(صـ.) ا) ووشیار، تێگەیشتو ، زانا :: ماشەڵڵا کوڕی من ئاقڵە . ب ) ئارام ، بێ‌قرەوبڕە، بێ‌هەستوخوسـت . :: منـاڵێنە ئـاقڵ دانیشـن . **بـاقڵ** ــ [ بە + ئاقڵ /١ ] ، ( کو. عـا. ) ، ( بنـد.) بەوجۆرەی کە ڕێی تێدەچێ، بەشێوەیێکی ئەقڵ لێکی‌دەداتەوە ، وەکو خەیاڵی لێدەکرێ ، وادیارە ، وادەردەکەوێ. :: باقڵ ئێمشەوتیش هەردەبارێ ، بـاقڵ ئەوسـاڵ زور گەرم دەبێ . باقڵ سـبەینی وەڕێ دەکەون . **باقڵم** ــ [ باقڵ + م (ز) ]، ( کو. عا.) ، (بند.) تە: باقڵ ( هەمو مەعناکـانی ، بەڵام بەوجـۆرەی کە یەکێك خۆی تێی‌دەگاو بەیەکێکی‌تری دەڵێ) :: باقڵم (بەعەقلی‌من) ئێمشەو هەردەبارێ .

**ئاقڵانە** ــ [ئاقڵ/٢ + ئانە/١] ، ( عا. کو.)، (بند.) بەشێوەی یەکێکی عاقڵ ، وەکو کەسێکی تێگەیشتو . :: هەرچێ پێـی بسـپێرن ئاقـڵانە ڕایدەپەڕێنێ ، ئەم‌کـارە ئاقڵانەیـە لەدەست هەموکەس نایێ ، خۆ دنیا خرانابێ جارێك ئاقڵانە بجوڵێتەوە.

**ئاقڵ بڕین** ــ (مصـد. لا.) ، (عا. کـو.) ، ( مکـ.) تێگەیشـتن و قبوڵ‌کردنـی کارێك یامەسـەلەیێ بەوجۆرەی کە باسـی‌دەکەن ، یـا بەوچەشـنەی کـە پیـاو خـۆی تێی‌گەیشتوە و بۆخەڵکی باس‌دەکا. :: ئاقڵ نای‌بڕێ ئەو پیاوە شـتی‌وا بکا . هەرچۆنێکی ئاقڵی بڕێ وادەکا. ئا بەم جۆرە ئاقڵ دەی‌بڕێ . ئاقڵی وای بڕیوە لۆمـەی مەکەن . هێچ ئاقڵم نەی‌دەبڕێ ئەم‌کارە وابـێ . ★ ئاقڵ گرتن . چۆنە ئەقلەوە .

**ئاقڵ بۆن** ــ ( مصـد. لا.) ( عا. کو. ) ، ( مکـ.) ١ــ بـۆنە خـاوەن هۆش ، هۆش هاتنەوە بەر ، هەست کردن و تێگەیشتن ، پێ‌زانین. ٢ــ تەمبێ‌گرتو بـۆن ، دەست‌کێشانەوە لە کارێك ، وازهێنان لە کردەوەیێك :: شێرکو ئیتر ئاقڵ بـوە چێـدی قومار ناکا . هەرچێ هەبۆ بە ڕایـز دۆڕاندی ئێستا بۆمان ئاقڵ بوە .

**ئاقڵ پێشکـان** ــ ( مصـد. لا.) ( عـا. کو.) ، ( مکـ.) سـەرەودەر کردن لە کاران ، لە مەسـەلەیەك ، لـە زانسـتێك ، لێزانـین . :: جەوهەر ئاقڵی بەوشتانە ناشکێ ،

هێچ نەمدەزانی خدر ئاوا ئاقلی بـە
شیعر دەشکێ ، جوامێر ئیتر گەورە
بوە ئاقلی بە چاکەر خراپە دەشکێ.

**ئـاقڵ تێکچوون** — ( مصت. لا.)
( عـا. کو.) ، ( مک.) ١ـ شـێوانی
ئـاقڵ ، لە دەسـت‌چوونی هەسـتی
تێگەیشتن و سەرەودەر کردن لـە
کاران ، لێك‌نەکردنـەوەی چـاکەو
خراپـە . ٢ـ ( کن.) شـێت‌بوون ،
خەرفـان .

**ئـاقڵ کردن** — ( مصت. مت.) ،
( عا. کو. ) ، (مک.) ١ـ تەمبێ‌کردنی
کەسێك ( بە قسە یا هەر کـارێکی
مەعنەوێ کە بێ‌ئێشێنێ ، یـا بـە
لێدانو پێ‌گەیاندنی زەرەری ماددێ)
:: وەهای بەگژ داچوو بۆ حەوت‌پشتی
ئاقڵ کرد . دارونەداری لێ بردەوە،
بۆ بابەلبابی ئـاقڵ کرد ٢ـ دابـین
کردنی منالآن و بێدەنـگ کردنیـان
( بە لێدان یا هەڕەشەر گوڕەشـە )
:: بێدەنگ بن دەنـا بـانگی دەکـەم
ئاقڵتان کا . ★ عاقڵ کردن .

**ئـاقڵ گرتن** — ( مصـت. لا.) ،
( عا. کو.) ، ( مک.) تە : ئاقڵ بڕین .

**ئاقڵی** — [ئاقل/١ + ٢ـئی] ،
( عـا. کو.) ، ( حمـصـ.) ، ( مک.)
١ـ تێگەیشـتوویی ، زیرەکـی
وورپایی . ٢ـ ( مجـ.) چاك ، چاکە.
:: زۆر ئاقڵی کرد کە دەنگی نەکرد،
دەنا لێیان دەبوو بەشەڕ . ئەم ئیشـەی
ئاقڵی بوو . ئەم ئاقڵییەی ئەو شێت‌و
شوورە کردوویـە کەس نـایکا . ★
عـاقڵی .

**ئاقیدە** — [ = عا : عقیـدة ] ،
( نا.) ، ( مک.) تە : ئیعتیقاد .

**ئاقیق** — [= عا : عقیق ] ، (نا.)
بەردێکە ، چەند جـۆری هەیـە ،
لەوانە هیندێکیان لە ڕیزی بـەردە
بەقیمەتەکان دەژمێردرێن و زیـاتر
دەکرێتـە نەقیمـی ئەنگوسـتیلە و
ملوانکە. . .بۆ خۆڕازاندنەوەی ژنان،
جـاران مۆریشـیان لێ دروسـت
دەکرد . بەردێکی ئاودار و جوانە ،
گەلێ ڕەنگـی هەیـە ، لە هەمـوان
پەسندتری ( سووری ئاتەشی )یە و
جۆرێکی تریشـی ( دڕۆبا )یە . لـە
باری کیمیاییەوە ئەم بەردە بەردێکی
( سیلیسـی )یـە و چەنـد زەڕە
( مۆلیکول ) ئاوی تێدایە کە ژمارەیان
لە ١٨ تێ‌نـاپەڕێ و لە جۆرەکـانی
ئاقیق دا کەم و زۆر دەبێ ، ئەگـەر
بیهاڕنەوە و بەسەر ئاگری وەرکـەن
وەکوو خوێ قرچەقرچ دەکا ، ئەوە
ئاوەکەیەتی کە دەبێتە هـەلم . لـە
بەردی تر سووك‌ترە و جاروبارە هێندە
سووك دەبێ کە سەرئاو دەکـەوێ ،
لە کوردستان هەندی نەوعی هەیە .
★ یاقیق . **ئاقیقی ڕەش (سەوز)** —
(نت.)بەردێکی سەوزی مەیلەو ڕەشە،
وەك ووردەشووشەی بوتڵی شکـاو
دەچێ ، لەتیرەی ئەو بەردانەیە کە
لە ئەنجامی ئاگرپژێنی هـەندێ کێو
پەیدابوون ، زور سـەخت و ڕەقـە
وەك تێغیش دەبـڕێ ، ئادەمێزادی
دەوری‌بەرد چەك و هەندی شتی‌تری
( سەرنێزە ، کێرد ، سـەرەرمب و
دەمەداس ...) لەم بەردە کـە لـە
گەلێ شوێنی کوردستـان دەسـت
دەکەوێ ، دروست‌کردوە .

**( ـ ئـاك )** — ( پب.) بـەدوای

ڕێشەی فیعلەوە دەنوسێ و دەیکا
بە ناوێ کە مەعنای ( بەکارهـاتن ،
بـە کەلکهـاتن ) دەدا :: پۆشـاك
( شتێکی بە کەلکی پۆشـتێن بێ ) ،
خۆراك ( هەرچی بەکەلکی خواردن
بێ ) .

**ئاکابر** ـ [= عا : اکابر ( اکبر )
= گەورەکـان] ، ١ـ (صـ.) ( مکـ.)
پیاوی بەساڵا چو ★ ئیختیار ٢ـ
(نا.) پیاوی گـەورە و بـەرێز لـە
کۆمەڵدا ★ ئەشراف ، ئەعیان .

**ئاکابرانە** ـ [ئاکابر + ئانە/١] ،
[عا. کو.] ، (بنـد.) ١ـ ئەوەی لـە
پیاوی ئاکابر دەوەشێتەوە ، کـاریکی
پیاوی ئاکابر بیکا. :: ئەم کوڕە بەم
منالێ خۆیـەوە کارێـکی هێنـدە
ئاکابرانەی کردوە ، پیـاو سـەری
سوڕ دەمێنێ . ٢ـ بەشێوەی پیاوی
ئاکابر ، وەکو ئاکابران . :: کـوڕم
تـۆزێ ئاکـابرانە دانیشـە ئـەم
جۆلەجۆلەت لە چیە ؟ .

**ئاکـادیمی** ـ [ = فرەنسـێ :
ئاکادیمی . لە یۆنانی وەرگیراوە ] ،
( نا.) ١ـ شوێنێکی تایبەتیە کـە
لەوێدا بەکردەوە فێری زانست یا
هەنەرێك دەبن . :: ئاکادیمی جەنگ ،
ئاکادیمی شۆڕش . ٢ ـ ئەنجمەنێکە
لەوێدا : ئەدیب و زانا و هونەرمەند
کۆدەبنـەوە و بـۆ پێشخسـتن و
پەرەپێدان و ڕێکخستنی بەشـێکی
دیاری لە بەشەکانی زانست ڕاوێژ
دەکەن و بڕیاڕ دەدەن . :: ئاکادیمی
فەرەنسا : بۆ نوسێن و ڕێکخستنی
قاموس لە ٤٠ ئەنـدام پێکهـاتوە ،
ساڵی ١٦٣٥ لەلایەن ( ڕێشێلیۆ )
دامـەزراوە . ئاکـادیمی زانسـت
( علوم ) : بۆ لێکۆڵینەوەی مەسایلی
ریازێ و فیزیا و کیمیا ، ... هتد ،
سـالی ١٦٦٦ ( کولبێـرت ) لە ٦٦
ئەندام و دو سکرتێری هەمیشەیـی
پێکیهێناوە ( تە : لارۆس ـ ٩٩٤ ) .
ئاکادیمی علومی سۆڤیێتی : بەرزترین
شوێنی زانستیە لە یەکێتی سۆڤیێت
(تە : کورتەی قاموسی سیاسی ـ٧) .
تێبیـ ـ أ ) ئەم ووشـەیە لە ناوی
دانیشگـایەك وەرگیـراوە کـە
(ئیفلاتۆن) لە باغی ( ئاکادیمۆس )ی
نیزیك شاری ( ئـاتێن ) پـایتەختی
یۆنان دەرسی فەلسـەفەی تێـدا
دەکوتەوە و بەناوی باغەکەی کردیو .
ب ) بەرامبەر بە مەعنـای دوەمی
ئاکادیمی، (مەجمەعی عیلمی کوردی)
لەبـەغدا ، ووشـەی ( کـۆڕ ) ی
دانـاوە و نـاوی خۆشـی نـاوە :
( کۆڕی زانیـاری کورد ) .

**ئاکار** ـ ( نمصـ.) ، ( مکـ.) ١ـ
خـو ، ڕەووشـت ٢ـ کـردەوە ::
ئاکاری باش نیە ، لە ئاکـاری ڕازی
بون .

**ئاکام** ـ ( نـا.) ١ ـ دوایـی و
ئەنجامی هەرشتێ ٢ـ وادەی مردنی
کەسێ □ « زیندە بە ئاکامە » .

**ئاگا** ـ [ پە : ئاکاس .] ، ( نا.)
١ـ خەبەر، هەست□«ئاگا و خەبەرم
لە مردنی خۆم هەبـو ، لەو کـارە
نەبو . » ● « ئاگای لە مەحمودی بێ
زەواد نیە » ( کنـ.) أ ) بـۆ گێلـێ و
تێنەگەیشتویێ کەسێ . ب ) بۆ بێ
خەبەری کەسێ لەکارێ. ٢ـ(صفا.)،
(سنـ.) تە : ئاگادار/١ ★ (بکـ.) ئاگاە

( تە : کف ـ ٣٩) ، های (کف ـ ٣٠١).
**بەئاگا هاتن** ـ ( مصتـ. لا.) تە : ئاگابۆنەوە . **وەئاگا هاتن** ـ ( مصتـ. لا.) تە : ئاگابۆنەوە .

**ئاگابۆنەوە** ـ ( مصتـ. لا.) وەخەبەر هاتن لەخەو یا لە مەستی، وەهۆش هاتنەوە لە بێهۆشی ، کە بەسەر یەکێکا هاتبێ جا لەبەر هەرچێکی بێت :: خەوی زۆر سوکە لە خشپەی پێ ئاگای دەبێتەوە . پیاوی سەرخۆش بۆ ئاو خواردنەوە ئاگای دەبێتەوە . ئەوە نێوەڕۆیە دلێر هێشتا ئاگای نەبۆتەوە . کە عەمەلیاتیان کرد شەو و ڕۆژێکی پێچوو یاللا ئاگای‌بۆوە . ★ ئاگاهی ( هو.) ، بەئاگا هاتن ، وەئاگا هاتن.

**ئاگادار** ـ ١ـ ( صفا.) حاڵی کەسێکی بە شتێك یا کارێك بزانێ ، خەبەرداری بێ :: هەر خۆی ئاگاداری ئەم ئیشە بۆ . هەر ئاگادار نەبۆن لەدەرەوە چباسە . ★ (سنـ.) ئاگا/٢ . ٢ـ (نفا.) کەسێکی یەکێك یا شتێك دەپارێزێ :: خوا ئاگاداری بێ ئاگاداری منداڵەکان بە .

**ئاگادار بۆن** ـ ( مصتـ. لا. ) بە باس‌وخواس ، کارێك یا مەسەلەیێك زانین ، خەبەردار بۆن . ★ ئاگالێ‌هەبۆن .

**ئاگادار کردن** ـ ( مصتـ. متـ.) خەبەردار کردنی کەسێك لەکارێك ، لە باسێك یا لە مەسەلەیێك ، ڕاگەیاندنی خەبەرێ(لەبابەت هەرچێ بێ ) بەکەسێ . :: ئاگاداری کاووس بکەن ئاگای لەخۆی بێ . پێش ئەوەی من‌بچم خەسرەو ئاگاداری کردبۆ .

**ئاگاداری** ـ ( حمصـ.) ١ـ زانین ، خەبەرداری :: بە ئاگاداری دۆکەسان پارەکەی بدەنێ . ٢ـ تە : ئاگاداری کردن .

**ئاگاداری کردن** ـ ( مصتـ. متـ.) تە : ئاگا لێ‌بۆن . :: ئاگاداری منداڵەکانی‌بکەن با پەرتەوازە نەبن . ★ ئاگاداری/٢ .

**ئاگا کردن** ـ (مصتـ. لا.) هەست پێ‌کردن،پێ زانین:: دەیگوت هەرچی دەمار لە لەشیدایە هەموی ئاگادەکا . لەشی هێندە سڕ بوە ئاگری پێوەنێی ئاگا ناکا .

**ئاگا لێ‌بۆن** ـ ( مصتـ. متـ. ) چاوەدێری کردن ، باڵ بەسەرکێشان و پاراستنی کەسێ یا کەسانی و شتێ :: ئاگات لە منداڵەکان بێ مەیەڵە ( مەهێڵە ) بێحەیایی بکەن . ئاگات لە باخچەکە بێ مریشك نەچنە ناوی . ئاگایەکتان لە دوکانەکەم بێ تادەچم نوێژ دەکەم. ئاگایەکت لێمان بێ .

**ئاگا لێ‌هەبۆن** ـ ( مصتـ. لا. ) تە : ئاگادار بۆن . :: ئاگات لێیە ( لێ هەیە ) چۆن ئاوڕێشی یەك بۆن . خوا لەوسەرە ئاگای لێ‌یە من دەستم لەم ئیشەدا نیە .

**ئاگاهی** ـ ( حمصـ.) ، ( هو.) ١ـ تە : ئاگا بۆنەوە □ « دڵە وادەی صوبح نەو وەهارانەن » « وەخت ئاگاهی دەردەدارانەن » ( مەولەوی : مکبـ ـ ٢٤٧ ) . ٢ـ تە : ئاگادار /١ □ « هەوای کۆتایی ناڵەی وێت بیەن » « وە تێری هەنی ئاگاهیت نیەن » ( مەولەوی : مکبـ ـ ٤٦٣ )

**ئاگایی** ـ ( حمصـ.)، ( سنـ.) ۱ـ تە : ئاگا . ۲ـ لێزانێتی ، سەلیقـە پێشکان . سەرڕشتە .

**ئاگر** ـ ( نا.) ۱ـ ڕوناکی و گڕ و گەرمایەکی لە سوتانی مۆتەمەنـێ ( دار ، خەلوز ، نەوت ، گـاز و..) بەدەست دێت و بۆ ڕزگـار بون لـە سەرمـا و بـۆ چێشت‌لێنـان و مەبەستی جۆربەجۆری ژیان ، کەلکی لێ وەردەگیرێ . ۲ـ ( مجـ.) ، أ ) گەرما ، گەرمای نەخۆشی :: هەمو گیانی دەلەی ئاگرە دایپسێ ، کـە نێوەڕۆ داهات دنیا دەبێتە ئـاگر . ب ) ڕق‌و تورەیی ، تـورە بـون :: جارێ قسەی دەگەل ناکرێ ئـاگرێ لێ دەبارێ . ج ) شەڕ و جەنـگ ، فیتنە و شەڕ و شـۆڕ :: هیتلـەر ئاگرێکی کردەوە دنیای سـوتاند و خۆشی سوتا . د ) چەك و تەقەمەنی :: هەمو گیانی خۆی کردوتە ئاگر. ★ ئـاتەش ، ئـاوور ، ئـاهێر . **ئـاگری بن‌کـا** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) کەسێکی لە سەرەوە خۆی پیاو چاك نیشان بدا و لە ژێرەوەش نێـوانی خەلك تێك‌بدا یـا خراپـە بکـا . کەسێکی شەڕ و هـەرا سـازکا و ئاژاوە بنێتەوە :: لاچۆ لەبەرچاومان مەمێنە هەی ئاگری بن‌کـا . چـۆن ئەم کابرایە لەم خەلکە بوتە ئـاگری بن‌کا . ★ ئاگری ژێرکا . ئـاوری بن‌کا . **ئاگری بێ‌ئامـان** ـ ( نتـ.) ، ( کـنـ.) بـەلا و چەرمەسـەریکی چارەکردنی گران بێ یا هەر نەکرێ. □ « ڕەببی ئاگری بێ ئامانیان تـێ بەربێ » . **ئاگری ژێرکـا** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) تە : ئاگری بن‌کا . **ئـاگری قودرەت** ـ ( نتـ.) ، (کنـ.) ۱ـ قەزا و قەدەر ، بـەلای لابـەلا:: ئـاگری قودرەتێیـان تێ‌بەربـێ . ۲ـ ئادەمێـزادی بـزۆز و نـەسرەوت بەتـایبەتی منـدال :: ئـەوە بـۆ دانامەزرێی ، هەی ئاگری قودرەتێ. ۳ـ پیاوی کار لەدەست‌هاتو ، ئازا و شەڕکـەر . :: دەلـەی ئـاگری قودرەتێیە هێچی لەبـەر دەسـتی عاسێ نابێ ، وەك ئاگری قودرەتێ وایە ، غەنێمی پەنجا سوارانە . ★ ئاوری قودرەت .

**ئاگرباران** ـ ( نـتـ.) ، ( کـنـ.) ۱ـ گەرمـای بێ‌ئەنـدازە . ۲ـ دابـارێنی گوللـە لە شـەڕدا ، دەستڕێژکردنی چەندکەس وێکڕا .

**ئاگرباران‌کردن** ـ ( مصتـ. متـ.) بۆمبا ، گوللەی تـوپ و تفەنـگ و هەرچی لەم بـابەتە بـێ بە سـەر جێگایەك یا کەسێکدا بەردانـەوە .

**ئاگربارانە** ـ [ ئاگرباران + ەـ ئە/۱ ] ، ( نتـ.) هەوایەکی گورانـێ کوردێیـە . □ « ئەی خـودا لـەم ئاگربـارانە ، ئەی خودا لەو ڕێـزە خالانە ، یار بەبێ تۆ مالم وێرانە. » ( فۆلکلۆر ) .

**ئاگربازێ** ـ ( حمصـ.) ، (سیمـ.) تە : ئاتەشبازێ .

**ئـاگربردن** ـ ( مصـتـ. لا.) بەهـاسـانێ ، داگیرسـان و زوئاگرگرتنی شتێك یا ماددەیێك . :: ئەم گوێنێیە تەڕە ئـاگر نـابا . پوشوکەی کوێخاحەسـەن ئـاگری چاك دەبرد . بارۆت خێرا ئاگر دەبا.

**ئـاگربڕ** ـ ( نت. ) ١ـ کـاری
کوژاندنـەوە و بەرگرتـن لـە
تەشەنەکردنی ئاگرێ کە بەر دەبێتە
خەرمان و ڕەز و ئەو جۆرەشتانە .
**تێبـ** ـ لە کوردسـتانێ بـاوە کـە
ئاگرکەوتـەوە ، خـەڵکی ئـاوایێ
کۆدەبنەوە و لـك‌وپۆپی داری تـەڕ
دەبڕن و لە چواردەورەی ئاگرەکەوە
بەردەبنـە شـۆڵێدانـی و ئـەو
شوێنانەی ئاگریان تێبەربوە لەوانەی
هێشتا نەیان‌گـەیوەتێ دادەبـڕن ،
بەم جۆرە پێش بە تەشەنەکردنـی
دەگرن و نایەڵن دەوروبەری خـۆی
بسوتێنێ ، لـەو جێگایـانەش کـە
داروباری نەبێ ، بە دەوری ئاگرەکەدا
وەکو جۆگە ئەرز هەڵدەقەنن . ٢ـ
( نت.) ڕاگرتنی شەڕ لە نێوان دوو هێز
کە پێکەوە بـە شـەڕ دێـن . ٣ـ
بەرگرتنـی تەشـەنەی هـەرا و
دەمەقالێ نێوان دوو یا چەند کەس .
**ئاگربڕکردن** ـ ( مصت. مت. ) ،
کوژاندنەوەی ئاگرێکی دەکەوێتەوە
بەو شێوەیەی لە (ئاگربڕ)دا باس‌کرا.
**ئاگربەربونەوە** ـ (مصت. لا.) ،
( سیم.) پەیدابـونی سـوتمان لـە
شوێنێك ، ئاگر دەجێگا یەك بەربون
:: لـە لای خەرمانەکـان‌ئاگرێ
بەربوتەوە هەرچـی دەکەن بۆیـان
ناکوژێتەوە .
**ئاگربەردانەوە** ـ (مصت . مت .)،
( سیم . ) ئاگرتێ‌بەردان ، سوتمان
پەیداکردن لە شوێنێ . :: چەتەکان
ئاگرێکیـان بەردایـەوە خێـرا
کوژاندیانەوە .
**ئاگرپارە** ـ [ ئاگر + پـار ( =
پارچە ، لەت ) + ە ـ ئـە/١ ] ،
(صت.) ١ـ بزۆز ، دڕ ، شەڕانێ ،
هاروهاج ( منـداڵ ) ٢ـ زێرەك ،
بەکار ، لێهاتو ( گەورە یا پچوك ) ★
ئاتەشپارە .
**ئاگرپەرست** ـ ( نفا . ، صفا .)
تە : ئاتەش‌پەرست .
**ئاگرپـەرستێ** ـ ( حمص . )
١ـ پەرستن ، عیبادەت‌کردنی ئاگر و
بـە خـودا زانینـی . ٢ـ دینـی
زەردوشتێ ★ ئاتەش‌پەرستێ .
**ئاگرپێوەنان** ـ (مصت. مت.) تە :
ئاگر تێ‌بەردان/١ .
**ئاگرتێ‌بەربون** ـ (مصت.لا.)١ـ ئاگر
گرتن و سوتانی شـتێك بێ‌ئەوەی
یەکێك بە دەست یا لـە ئانقەست
بیسوتێنێ . :: ئوتومبیلەکەی ئاگری
تێبەربو ، کوژە هێندە لـە سۆبەکە
نێزێك مەکەوە با ئاگرت تێبەرنەبێ .
★ ئاگرگرتن/١ . ٢ـ ( کن.) ، ١ )
سوتان و فەوتان ، لەناوچون :: کوژە
دانیشە هەی ئاگرت تێبەربێ ، یاخوا
ئاگر دە عومر و ماڵیان بەر بێ . ب)
نارەحەت‌بون ، لەبەر زگ پێسوتان و
بەزەیی‌هاتنەوە بە حاڵی یەکێکدا .
:: پیاو هەر نەیبێنێ چاکە ، ئاگری
تێبەردەبێ ، ئاگرم بۆی تێبەربو ج)
تە : ئاگرگرتن/٢ .
**ئاگر تێ‌بەردان** ـ (مصت. مت.)
١ـ ئاگر بە سوتەمەنێ،یا هەرشتێکی
ترەوە نان، بەمەبەستی ئاگرکردنەوە،
یا زیان‌پێ‌گەیاندن :: زۆر سەرمایە ،
خێرا سۆبەکە ئاگرتێ‌بەردە . هەندێ
پوش‌وپەڵاشمان ئاگرتێ‌بەرداو خۆمان

پێ ووشك كردەوە . ٢ـ ( كن . ) ڕقهەڵساندن و تووڕەكردنی یەكێك بەقسە یا بەكردەوە :: ئەوە چت پێ گوتوە وا ئاگرت تێ بەرداوە . ئەم قسەیە چبوو كردت ئاگرت دەم ( دەئەم ) كابرایە بەردا . ٣ـ (كن . ) أ) زیانی ماددی و ئازاری مەعنەوی بەكەسێ یاشوێنێك گەیاندن :: لەشكری ئەمەریكا هەموو ویێتنامی ئاگر تێ بەردا و سووتاندنی. ئەوەندەمان پێ خەرج كرد ئاگرمان تێ بەردا . ب) ئیجادی حاڵەتی بەزەیی پێداهاتن و زگ پێ سووتان لە دڵی كەسێكدا :: هێندە دەكڕوزێتەوە ئاگر دەپیاو بەردەدا . ● « ڕەببی ئاگر دە گیانی بەربێ» تووك و نزایە و كینایەی داوای مردن و لەناوچوونی كەسیكە . ★ ئاگرپێوەنان ، ئاوور تێ بەردان .

**ئاگر تێ چوون** ـ ( مصت . لا . ) ١ـ تم : ئاگرگرتن/٢، ئاگرتێ كەوتن. ٢ـ ( كن . ) بەغیلی بردنی كەسێك بە كەسێكی تر :: هەر باسی پیاوەتی حەسەنمان كرد ، ئەو ئاگری تێ چوو . یەكێك بەكوك و پۆشتەیی ببینێ ئاگری تێدەچێ . نەمانزانی بۆچی وا ئاگری تێ چووبوو .

**ئاگر تێ كەوتن** ـ (مصت. لا.) تم : ئاگرتێ بەربوون /١ .

**ئاگر چوونە گیان** ـ (مصت . لا.)، ( كن . ) ١ـ تم : ئاگرتێ بەربوون/٢ ٢ـ تم : ئاگرگرتن/٢ .

**ئاگرخانە** ـ ( نت . ) ، ( سیم . ) ١ـ كورەی ئاسنگەران كە ئاسنی تێدا سوور دەكەنەوە . ٢ـ تم : ئاتەشخان . ٣ـ تم : ئاتەشخانە ★ ئاوورخانە ، توونخانە ، تونكخانە .

**ئاگرخۆرە** ـ [ ئاگر + خۆر ( خواردن ) + ٥ ـ ئە/١ ] ، (نت.) ، ( سن . ) تم : قەقنەس . ( تم : مخ : ج ١ ـ ١٧ ) .

**ئاگرخۆش كردن** ـ (مصت. مت.) ١ـ دەست تێدان و تێكوەردانی ئاگر ( كۆكردنەوە و خستنەسەریەكی سووتەمەنی ناو سۆبە و ئاگردان ) تا باشتر بسووتێ. ٢ـ تێكوەردانی ئاگری خەڵوز و تەپاڵە و ... تا خۆڵەمێشەكەی لەسەرلاچێ و تینی زۆرتربێ . ٣ـ (كن .) قسە هێنان و بردن لەنێوان دووكەسا كە نێوانیان ناخۆش بێ ، ناخۆشتركردنی نێوانی دووكەس ، فیتنەیێ كردن .

**ئاگر خۆشكەر** ـ [ئاگر + خۆش + كەر ( كردن ) ] ، ( صفا . ) ، ( مك . ) كەسێكی فیتنەیێ دەكا ، یەكێكی دەبێتە هۆی نێوان ناخۆشی و بەشەڕهاتنی خەڵك :: ئاگرخۆشكەری وا هەر نابێتەوە ، ئەوەندەی مست لە چاوان دەی شارێكی بەشەڕ دەدا . پیاوی ئاگرخۆشكەر هەمیشە ڕۆژمردە .

**ئاگر خۆشكەرە** ـ (نفا.) ، (مك.) ئەوەی ( كەسێ ، شتێ ، یا كردەوەیێك ) كە ببێتە مایەی بەرپابوونی شەڕوشۆر و فیتنە لەناو خەڵكا ، یا لە شوێنێك :: ئاگرخۆشكەرەی ئەم دێیە ، ئەم هەتیوەیە ، ئاگرخۆشكەرەی ناومیللەتان ئیمپریالیزمە .

**١ـ ئاگردان** ـ [ ئاگر + دان

پاشایەتی ، پیاوەتی ، جیرانەتی . تێب ـ أ ) کاتێ دوامین پیتی (ناو)ەکە (دەنگ)ێك بێ ، دەگەڵ پاشبەندەکە تێك دەکرێنەوە و دەنگی (هەمزە)کە لە ناو دەچێ . ب ) بەڵام ئەگەر ناوەکە بە یەکێ لە دەنگ بزوێنەکان بڕابێتەوە ، ئەوا (هەمزە)کە دەگۆڕێ بە ( ی ) و ئەو جار تێك دەکرێنەوە .

**ئەجر** ـ [ = عا : اجر ] ، (نا.) ١ـ پاداشتی چاك . □ « خودا ئەجرتان بداتەوە ، ئەجری خێرتان بداتەوە » ٢ـ (مج.) حەق ، پاداشتی حەقێکی مەعنەوێ کە کەسێك بە سەر یەکێکی ترەوەی هەبێ . :: ئەجری دایك و باب لە سەر ئەولاد زۆرە ، ئەوا ئەجری دایکت دایەوە .

**ئەجزا** ـ [ = عا : اجزاء ] ، (نا.) ١ـ پارچە و لەت و کوتی شتێك .

□ « پەی چیش خاڵۆکەی دەرۆن
جەهۆن کەیل »
« خەیلێن ئەجزای مەیل ، لە
ملەکەی پڕ مەیل »
( مەولەوێ : مکب ـ ١٩٨ )
« دۆدی بن مێچی گولنکی
لەتلەتی دەسرازە کۆن »
« بان و دیواری بە میسلی
لانکی ئەجزا شکاو »
( نالی )

٢ـ ( کنێر . ) کاربەدەستی دایرەیێکی دەولەت .:: ئەجزای دارایی ، سەعیدخان ئەجزای گومرگێ بۆ ★ ئەعزا/٢ . ٣ـ هەمۆ ئەو ماددە پلاستیکیانە تازە پەیدا بۆن :: ڕەشو تەسبیحێکی ئەجزای باشی هەبۆ ، ئەم دارجگەرەیە ئەجزایە شقارتەی پێوەنێ گڕدەگرێ . تێب ـ ئەم وشەیە جەمعی ( جزءِ ، جزو )ە وشکم هەیە کە (جزءِ) یا (جزو) عەرەبی ڕەسەن بێ و لام وایە دەگەڵ گۆش ، گۆشە ، گۆشت و گوێ خزمایەتێکی هەیە .

**ئەجزاچێ** ـ [ ئەجزا + چێ ] ، (صفا.) ، (کمر.) ئەو کەسەی پێشەی دەرمان فرۆشتن بێ . :: ئەسکەندەری ئەجزاچێ لە سلەیمانێ ئەجزاخانەی هەبۆ . ★ (کنێر.) دەوافرۆش .

**ئەجزاخانە** ـ [ ئەجزا + خانە ] ، (نت.) ، (کمر.) ١ـ ئەو دوکانەی دەرمانی نەخۆشی لێ دەفرۆشرێ . ٢ـ صندۆقێکی پچکۆلەیە کە هەندێ دەرمانی پێویستی تێدا دادەندرێ بۆ ناومال و شوێنی گشتێ . ★ (کنێر.) دارۆخانە ، دەواخانە . (کمر.) صەیدەلییە .

**ئەجندە** ـ (نا.) ، (مک.) مەوجۆدێکە ، گۆیا هەیە و بەرچاوی ئادەمیزاد ناکەوێ ، پێشۆنیان بڕوایان وا بۆ دەست لە هەرکەس بوەشێنن شێتی دەکەن . :: ئەجندە دەستیان لێوەشاندوە ، ئەم ژۆرە ئەجندەی تێدایە . ٢ـ (مج.) ئینسانی زۆر زیرەك بە تایبەتێ کە بالای پچکۆلەبێ . :: هەردەلەی ئەجندەیە . ★

جنۆکە ، جنـدۆکە (بک.) مەچێتر ( لە ئێمە چاکتر ) .

**ئەجەل** ــ [ = عـا : اجـل = وەختی شـتێك ] ، (نا.) وەعدەی مردن ، ئەو دەمەی ژیانی کەسێك تێیدا تـەواو دەبێ . □ « بـزن ئەجەلی هـات تێشـوی شـوانی دەخوا » . **ئەجەلی‌خۆ** ــ مـردنی تەبێعی ، مردن بـە بێ هۆیەکی لە لاوە :: نەوەڵلا ! هەر بە ئەجەلی خۆی مرد . **ئەجەلی هاتوە** ــ (کن.) کاری وادەکـا دەبێ ببێتـە هۆی مردنی ★ ئەنجەل ، عەنجەل .

**ئـەح** ــ (ند.) نیشـانەی بـە سوکزانینی ڕوداوێك و بە چاوی سوك و بێ ئەهمیەت تەماشاکردنی کـار و کـردەوە و کەسێکە . □ « ئەح ! پـەکم بـەوە کەوتـوە وسواغا ئەمن دەبێنێ یا نام بێنێ » (تحفه : ج۲ ــ ۹۳) .

**ئەحباب** ــ [= عـا : احباب ] ، (نـا.) دۆسـتان ، یـاران ، خۆشەویستان :: کۆمەڵێ دۆست و ئەحباب پێکەوە دابنیشێن .

□ « گوتم شێرن دوو لیموێکە مەمکت لێم ترش ڕوبو »
« کوتی نازی حوسن نەقدی تورنجێ دەستی ئەحبابە »
( ئەدەب : گم ــ ۸۷ )

**ئەحسەن** ــ [= عا : احسنت] ، ( ئه.) ، ( کنێـر.) چـاکت‌کرد زۆر باشە ، ئافەرین .

**ئەحمەدومەحموودکردن** ــ (کن.) ۱ــ لەم‌لاو لا و بە دەردی‌سەرێ ، بژێوی‌ خۆ پەیداکردن . □ « ... تا مێـردەکەشم نەگێـرابو ، هەر باشتربو ، ئەحمەد و مەحموودێکی بـو ئەکردێـن ... » ( ــ : ژان ــ ۱۹۲ ) ۲ ــ پـەل‌کوتـان بـو هەمـو لایـەك ، لـە هەمـو دەرگایـەکدان ، هەڵپەهـەڵپ‌کردن ( بو هەر مەبەسـتێ بێ ) ۳ــ بە فێـڵ و درۆ و دەلەسـەکاری خۆ مەیسەرکردن .

**ئەحمەق** ــ [ = عا : احمق ] ، (صـ.) تێ‌نەگەیشتو ، گێل و نەفام .

□ « وەکـو یەك دێتە بەرگـوێی پیاوی ئەحمەق »
« بیەفێری بولبول و ئـاوازی لەقلەق »
( ؟ ) .

**ئەحمەقانە** ــ [ عـا. کـو.] ، ۱ــ [ ئەحمـەق + ئانـە /۱] ، (بنـد.) وەکو نەزانان ، بە شێوەی گێل و نەفامـان . :: ئەحمـەقانە دەجوڵێتەوە ، هێنـدە ئەحمەقانە قسـە دەکـا پیـاو بـە خۆیـدا دەشکێتەوە . ۲ــ [ ئەحمـەق + ئانە/٤ ] ، (صـد.) کارێکی لە پیاوی ئەحمەق بوەشێتەوە . :: ئەم کارە ئەحمـەقانەیە چ بـو کـردێ ، کردەوەکـانی هەمـو ئەحمەقانـەیە گوێی مەدەیە .

**ئەحمەقی** ــ [ ئەحمەق + ۲ــ ئـێ ] ، [ عا. کـو. ] ، (حمصـ.) حاڵـەتێ کـە پیـاوی ئەحمـەق هەیەتی ، نەزانێ و تێ‌نەگەیشتوێی. :: بە ئەحمەقێ خۆی بەخشن .

**ئەحوال** ــ [ = : احـوال ] ، (نا.) ۱ــ چلۆنـایەتێ کەسێك لە

باری نەخۆشی و ساغی‌یەوە . :: ئەحوالتان چۆنە ، دیارە شوکور چاتری . ٢ـ چلۆنایەتی باری گوزەران و ژیان . :: ئەحوالی زۆر باشە ئەو ساڵ دەغلەکەی باشی هێنابو .

□ « پرسیویە زاهیرا لە ڕەفیقانی یەك جیهەت »
« ئەحوالی ئەهلی شار و ڕەفیقانی سەربەسەر »
( سالم : گم ــ ٦٧ )

**ئەحوالپرسی ــ** [ عا. کو. ] (حمص.) ١ـ پرسیار لە ساغ و سلامەتی و نەخۆشی کەسێك . ٢ـ پرسیار دەربارەی چۆنێتی ژیان و کار و گوزەرانی یەکێك □ « ... شێخ کە ئەحوالپرسی و خۆش‌هاتنی مەلا جەلالی کرد ... » (قزلجی : پێکەنین ــ ٦٢) .

**ئەخبار ــ** [ = عا : اخبار ] ، (نا.) ١ـ دەنگ و باسی ڕوداوێکی سیاسی ، کۆمەلایەتی و .... ٢ـ دەنگ و باسی سەفەر و هاتوچۆ و کار و کردەوەی کەسێك یا کۆمەلێك .

**ئەخت‌وچار ــ** (نت.) ، (مکـ.) هەوڵ و تەقەلای زۆر . :: هەرچەندی ئەخت و چارم کرد ، بێ فایدە بۆ دەگەلم نەهات و نەهات . تێبـ ــ وەکۆ دەبینین ئەم وشەیە لە دوکەرت پێکهاتوە ، کەرتی دوەمیان (چار) ڕون و ناسراوە . بەلام (ئەخت) وشەیێکە تەنیا لە موکریان و ئەوێش هەر لەم وشە (مرکب)ەدا بیستراوە و زۆرێش بە کار دەهێنرێ ، جا لەبابەت ئەسلەکەیەوە دو ڕێی دەچێتێ : ١ـ لەوانەیە ( عهد )ی عەرەبی بێ و جەڕابێ ، کە ئەمەیان بە لای منەوە ئیحتیمالێکی کز و بێ هێز و پێزە . ٢ـ لە کوردستانی تورکیا (ئەختی ، ئاختی ) ناوە بۆ پیاوان ، حاجی ئەختی ( محەممەد ئەفەندی مەحامی ــ باقی تۆژۆ ــ ) یەکێك بوە لە ناودارەکانی شۆڕشی شێخ سەعید [تم : دۆزا کوردستان: زنارسلۆپی ( خوالێخۆش‌بو : قەدری‌بەگ جەمیل‌پاشا ) ــ لاپەڕە ٨٢] ، قەدری‌جان دەڵێ : « دەستی کو ئەختی هەلدایە سەردار + چاڤا تە هەژاند ئەو دەستێ گەمار » . ٣ـ « .... دەپشکی ٨١ی (ئابان‌یەشت) داهاتوە کە (یۆئیشتە) لە بنەمالەی (فریانە) قوربانی بۆ (ئەناهیتە) کرد و لێی پاڕایەوە کە بەسەر (ئەختییە)ی سەرکێش‌دا زالی‌کا » (تم : پد ، یگـد. ج ٢ ــ ٣٩٣) ، هەر لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا پرۆفسۆر ( پۆرداوود ) ئاوا دەڵێ : « داستانی (یۆشت فریان )و (ئەخت) مەوزوعی کتێبێکی بچوکی پەهلەوییە . ( ئەخت )ی جادوباز بە سوپایێکی زۆرەوە هاتە شارێك و گوتی شارەکە خاپور دەکەم ئەگەر کەسێك نەبێ بتوانێ ٣٣ مەتەڵی من هەلبێنێ . یەکێ لە پیاوچاکان کە (یۆشت‌فریان) بێ وەلامی هەمو پرسیارەکانی دایەوە و (ئەخت) لە لە وەلامی سێ پرسیاری ( یۆشت

فریـان )دا ، دامـا و کـوژرا » . (ئەختییە) کە لە (ئاوێستا)دا ناوی جادوگەرێـك بوە ، ئێسـتاش لە کوردستان هەر نـاوە ، جا ئەگەر بڵێین هەرتکیان یەکن لەوانە نیە لە ڕاستی لامان دابێ . (ئەختییە) خۆی لـە قالبـی صـفەت و ئیسـمی مەنسوبدایە و دوور نیـە لە کاتی خۆیدا وەکـو لەقەب بە مـانای : زۆرزان ، لێـزان ، فێڵباز و ... درابێ بـەو (جادوگەر )ە ئێسـتا خۆشـی و ماناکـەشی لە بێـران چۆنەوە و (ئـەخت)ی موکریانییان لێ بەجێماوە .

**ئەختــەر** ــ [فـر.] ، (نـا.) ١ــ تە : ئەستێرە .

☐ « عالەم بە یەکا دێن و دەچن هەروەکو مەحشەر »

« یەك یەك بەمەسەل مانگ و یەکێ هەروەکو ئەختەر »

( قانیع : گوڵاڵەی مەریوان ــ ٣٠)

٢ــ ناوە بۆ ئافرەتان .

**ئەختەرشناس** ــ ( صفا.) تە : ئەستێرەناس .

☐ « جەو دما ئەصحاب (زیج) و ( ئوستوڕلاب ) »

« ئەختەرشناسان ، ئەڕستو خیتاب »

( خانا ــ ٢٠ )

**ئەختەرشناسی** ــ (حمص.) تە : ئەستێرەناسی .

**ئەخلاق** ــ [ = عا : اخلاق ] ، (نا.) ڕەووشت و خو .

☐ « کانی ئەخـلاق و سـیمای جوانم زۆ »

« قالەڕۆ ، قالەی ئایشە خانم ڕۆ »

( سەلام ــ ١٨٥ )

**١ــ ئەدا** ــ (نا.) ١ــ شێوە و جۆری هەسـتان و ڕۆنیشـتن . ٢ــ لەنجە و لار ، ناز و عیشوە .

☐ « دڵێـکی غەمـزەدەم بـۆ مەحرەمی ڕاز »

« ئەوێشـت لێم بـە صەد شێوە و ئەدا سەند »

( ئەدەب : گە ــ ٣٥ )

**٢ــ ئەدا** ــ [ = عـا : اداء ] ، (نا.) ١ــ بە جێگەیاندن ، جێبەجێ کـردن ، بەجێهێنـان . ٢ــ تە : ئەداکردن/١ .

☐ « هەرچەنـد بـە مەسـەل خەنجەری ئەڵماسە زبانم »

« نابڕێ سـەری مـوێ لە ئەدای شوکری نیعمەتان »

( ڕەزا ــ ٣١ )

**ئەدادەرهێنان** ــ [ ١ــ ئەدا + دەرهێنـان ] ، (مصتـ. لا.) ١ــ جوڵانەوەی نائاسایی . ٢ــ خۆ بادان و دەمخوارکردنەوە ، لاسای یەکێك کردنـەوە . ٣ــ بە قسە و ئاکـاری سـەیر خەڵـك هێنـانە پێکەنین .

**ئەداکردن** ــ [٢ــئەدا +کردن] ، ( مصتـ. لا.) ١ ــ بەجێگەیـاندنی پێویستەکانی دینی ئیسـلام لـەو کاتانەدا کە بۆیان داندراوە ( کردنی پێنج فەڕزەی نوێژ و گرتنی ڕۆژو لە ڕەمەزانا ) // قەزا . ٢ــ دانەوەی قەرز . ٣ــ ( کعر.) بەجێگەیاندنی پێویستەکانی کۆمەڵایەتـی . ٤ ــ

دەربڕین ، وەڕۆخستن .
□ « نە قسە نە ڕاز بۆم نەکرا ئەدا»
« ستینەمایی بۆم خۆم نیشان ئەدا »
( سەلام ــ ٨١)

**ئەدرەس ــ** ( نا.) ، (کعر.) تە : ئادرێس .

**ئەدنا ــ** [= عا : ادنى ] ، (صـ.) نیزیکتر ، نزمتر، پچوکتر:: شەرقی ئەدنا . ئەدنا خراپەیەکی بەسەرەوە مەچن .

**ئەدوا ــ** ( نا.) ، (مکـ.) ١ــ داوودەرمانی تام و بۆنخۆش کە دەکرێنە ناو چێشت و هەندێ خواردەمەنی دیکەوە . ٢ ــ زەردەچێوەی هاڕاوە :: ئیستوەت و ئەدواتان لە بیرنەچێ. هس: ئەزوا، ئەزبیە . تێبـ ــ لام وایە ئەم ووشەیە ( أدویه )ی عەرەبییە و جەڕاوە .

**١ــ ئەدەب ــ** [ عا.] ، ( نا.) شەرم بە خۆیی ، سەنگینی و گرانی لە هەستان و دانیشتنی ناو مەجلیسان ، حورمەتگرتنی گەورەتر لە خۆ ٢ــ (مجـ.) ، أ ) ئەو شوێنانەی لەشی ئادەمیزاد کە ناو هێنانیان شۆرەییـیە . ب ) تە : ئابخانە . ★ عەدەب .

**٢ــ ئەدەب ــ** [ عا.] ، ( نا.) یەکێکە لە زانستەکان کە لکی زۆرن : ڕێزمان ، بەیان و بەدیع ، عەروز و قافیە ، شیعر و نوسین ( معین : فەرهەنگ . جـ ١ ــ ١٧٨ ) :: ئەدەبی یۆنانی ، ئەدەبی عەرەبی
□ « لە (ژین)ەوە ئەمە شاباشی
ڕێی ( گەلاوێژ )ە »
«لە پایەی ئەدەبا نوکتە بێژ و
هەمگوڵڕێژە »
( پیرەمێرد ــ ١٦٠ )

**ئەدەبخانە ــ** ( نتـ.) تە : ئابخانە
□ « ئەدەبخانەکە و حەوزی
تێکەوتن »
« پڕیانە لە ئاو ، هێندە بێ
بەختن »
( پیرەمێرد ــ ٢٦٥ )

**ئەدەبکردن ــ** [ ١ــ ئەدەب + کردن ] ، [ عا. کو.] ١ــ (مصتـ. لا.) شەرمکردن لە کردنی کارێك :: قوربان ئەدەب دەکەم عەرزتانکەم
□ « ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر
تەقویەتی سەبەب دەکا»
« عارفی وەحدەتئاشنا لەم
قسەیە ئەدەب دەکا»
( نالی : گە ــ ٩ )
٢ ــ ( مصتـ. متـ.) تەنبێکردنی کەسێك (بە لێدان و جنێو ... ) تێبـ ــ دەبێ بەمانایە لە ئەسڵا (بەئەدەبکردن)بێ، چونکو بێ ئەدەب بە ئەدەب دەکرێ .

**ئەدەبیات ــ** [ ٢ــ ئەدەب + ئات ] ، ( نتـ.) ١ــ هەمو کەلەپوری ئەدەبی نەتەوەیێك ، وولاتێك یا زەمانێك . :: ئەدەبیاتی کوردی ، ئەدەبیاتی چەرخی شازدەهەمی فەڕانسە ، ئەدەبیاتی شۆڕەوی ، « شیعر و ئەدەبیاتی کوردی » یادگاری مامۆستا ڕەفیق حیلمییە. ٢ــ هەمو بڵاوکراوەکانی پارتێکی سیاسی .

**ئەدەبی ــ** [عا.] ، ( صـ.) هەر کار یا شتێکی پێوەندی بە ئەدەبەوە ( ٢ــ ئەدەب ) هەبێ . :: گەلاوێژ

گوڤارێکی ئەدەبی بوو . (دایک) شاکاری ئەدەبی ماکسیم گۆرکییە.

**ئەدیّ** ـ ( ئم.) ، (مک.) ١ـ لە وەڵامی پرسیارێکا بە ڕاست زانینی قسەی پرسیارکەرەکە دەگەیێنی . :: باش خەوتن ؟ ـ ئەدیّ. ئەریّ منداڵەکان چوّنە مەکتەب ؟ ـ ئەدیّ، چەند لەمێژە. ٢ـ ڕستەی پرسیاری تێکەڵ بە سەرسوڕمانی پیّ دەست پێدەکریّ و ئەم مەبەستانە دەگەیێنیّ: کەوایە، کەوابوو، ئەگەر بەم جوّرە بیّ، مەگەر . :: ئەدیّ ئەوە بوّ کویّ دەچن. ئەدی توّ نەتگوت نانت خواردوە . ئەدیّ لە کنە خوّی دوێنیّ دەڕوّیشتن . ئەدی نەدەبوو لە سەری ڕاوەستن تا دیّتە دەر . □ « ئەدی چ بکەم لە ڕوّی دنیایە؟ » ( تحفه : ج ٢ـ٢٥٨) . ★ (سیم.) ئەی ، ئەبیّ . هس : بەدیّکردن ، وەدیّهاتن تێبـ ـ ئەگەر دەنگی (د)ە کە بگیریّ (تەشدیدبکریّ) و دەنگی (ی)ش توّزی زیاد لە پێویست درێژبکرێتەوە ، نیشانەی گاڵتە پێکردنە . **ئەدیّچوّن** ـ (شر.) ١ـ لە حاڵێکا یەکێک ڕای لە قسەی کەسێك نەبیّ و بەو جوّرە دە مەسەلەیەك نەگا کە ئەو کەسە باسی دەکا ، بە ڕاوێژی پرسیار بە ( مخالف )ەکە دەگوتریّ و مانای ئەوەیە : ئەگەر ئەو مەسەلەیە یا ئەو قسەیە وا نیە کە من دەیڵێم ، بە ڕای ئێوە چوّنە . ٢ـ کاتێك کەسێ کارێکی سەرەڕای ئەوەی کوّسپیشی لە سەر ڕیّ بوە یا هەیە ئەنجام داوە یا دەدا دەگوتریّ ، جا یا بە تەنیا و بە شێوەی پرسیار یا لە سەرەتای ڕستەیێکی پرسیارێدا . :: بەفرێکی زوّر بارێوە هەموو ڕێگای گرتوە ؟ ـ ئەدی چوّن دەچن ؟. **ئەدیّنا** ـ(شر.) بوّ داوای ڕای موافق لە کەسیّ دەگوتریّ :: ئەو هاوێنەی دادیّ شێرکوّ دەچێتە ماڵی خاڵی ، ئەدیّنا ؟ .

**ئەدیب** ـ [=عا : ادیب ] ، (نا. صە.) ئەو کەسەی دەستی ( ٢ـ ئەدەب )ی هەبیّ ، شارەزای نوّسین و شیعردانان بیّ :: کتێبی «ئەنجمەنی ئەدیبانی کورد» لە ئەستەمبوّڵ چاپ کراوە . پیرەمێرد ئەدیبێکی گەورەی کورد بوو . تێبـ ـ ئەم ووشەیە ئەگەر لە پێش (ناو)ە و بیّ ( ناو )ە و ئەگەر بە دوای (ناو)یشدا هات ، ئەوا صفەتە . :: ئەدیبێکی کورد. کوردێکی ئەدیب

**١ـ ئەر** ـ ( بن.) تم : ئەگەر

□ « سەلاح هەر ئێدەن ، ئەر توّش
زەروّرەن »
« ئەر جە عەشق تو ، دیدەش
بیّ نوّرەن »
( خانا ـ ١٧٣ )

**٢ (ـ ئەر)** ـ ( ئم.) ئامرازی داتاشینی ئیسمی فاعیلە : ١ ) دەگەڵ ڕیشەی مەصدەران تەرکیب دەبیّ و ئیسمی فاعیل پێکدێنیّ :: نوّسەر ، خوێنەر ، کوژەر ، بژەر. تێبـ ـ ئەم شێوە داتاشینە ، ئێ ئەم ٢٠ ـ ٣٠ ساڵەی دواییە و گەلیّ ووشەی پیّ داتاشراوە . ٢) بە دوای ستیفەی موفرەدی ( ئەمر )ەوە دەنوّسیّ و پاش فڕێدانی ئامرازی

ئەمر (ب) ، پاشبەندێك پێكدێنێ
کە ئەگەر بە دوای ناوێکەوە
بلکێندرێ دەیکاتە ناوی فاعیل ::
بکە ( لە : کردن ) ــ ب +(ــئەر)
= ــ کەر + کار = کارکەر
بدە ( لە : دان ) ــ ب + ( ــ ئەر )
= ــ دەر + بانگ = بانگدەر

**ئەرباب** ــ [عا.] ، (نا.) ١ــ (سن.) خاوەنملك ، پیاوی گەورە ئەعیان و ئەشراف . ٢ــ (مك.) ، أ ) بازرگانی گەورە کە کالا بە دوکاندار و کاسبان دەفرۆشێ ، نیسبەت بەو کەسانەی سەودای لێدەکەن . ب) خاوەنی‌کار نیسبەت بە دەست و پێوەندی خۆی ( میرزا ، شاگرد ، خزمەتکار ...) ٣ــ ئەهلی هەر کارێك :: ئەربابی قەلەم ، ئەربابی ڕابواردن ، ئەربابی شەڕ

□ « لەبەر قاپی سەرا سەفیان
دەبەست شێخ و مەلا و زاهید »
« مەتاقی کەعبە بۆ ئەربابی
حاجەت گردی سەیوان بۆ »
( ڕەزا ــ ٣٨ )

٤ــ ( ص. ) ، ( مك. ) پیاوی خۆش مەشرەف و ڕۆخۆش ، ئەو کەسەی بێ ئەوەی گوێ بداتە خوی یا عادەتی خۆی بۆ ئەوەی مەجلیس لە خەلك تێك نەدا دەگەلیان دەگونجێ .

**ئەرامەندە** ــ [ئەرام + ئەندە ( ــ ئندە ) ] ، (صت.) ، (هو.) حالی کەسێکی توشی گیروگرفتێ بوبی و سەری‌لێ‌شێوابێ ، متحیربێ .

□ « جەواتەی شێرۆ
سەرەفگەندەبێن »
« جەسەودای گەردوون
ئەرامەندەبێن »
( خانا پ ٦٧٩ )

تێب ــ ئەم ووشەیە لە (ئەرام) و پاشبەندی (ئەندە) ــ کە شێوەیێکی تری (ئندە) یەو زیاتر فارسییە تاکوردێ ــ پێکهاتوە . (ئەرام) خۆی ووشەیێکی پەهلەویەو مەصدەرکەی (ئەرامێتەن) و (نمص.) یشی ( ئەرامیشن ) ە کە مانایان : (ئائاسودەیی و ئۆقرەنەگرتن )ە و تەواو پێچەوانەی ( ئارام ) ە کە بەمانای ( دامەزران و ئۆقرەگرتن ) هاتوە . (ئەرام)ی پەهلەوێ تەرکیبێکە لە ئامرازی نەفی (ئە = نا ) و (رەم)ی ئاوێستایی بە مەعنای ئیسراحەت‌کردن و ڕۆکەوتن . بەتێکرایی ئەرامەندە [ئە + رام + ئەندە ] دەبێتە ئەوکەسەی ئیسڕاحەتی لێ‌هەلگیرابێ .

**ئەرخەوان** ــ ( نا. ) ١ــ دارێکە، گەلاکانی خڕن ، گولی‌سوری هەیە، لە سەرەتای بەهارا دەپشکوێ و سەرتاپای دەبێتە گول ، گولەکانی تۆزی شیرنایییان تێدایەوە هەندێ کەس دەیخۆن .

□ «کارێزی شەرێف ئاوی‌نەماوە»
«ئەرخەوان لق و پۆپی شکاوە»
( پیرەمێرد ــ١٠٨)

٢ــ ناوە بۆ ئافرەت . :: مامە حەسەنی ئەرخەوانێ کەبابچێ بۆ لە مەهاباد .

**ئەرخەوان‌سوور** ــ ( نت. ) ، (سیمە.) فەسلی لافاوی بەهاران .
تێب ــ دوو هۆی هەیە کە ئەو فەسلەیان وا ناو ناوە ، یەکەم چونکو

دەکەوێتە وەختێ کە داری
ئەرخەوان گوڵ دەکا ، دوەمیش
لەبەر ئەوەی کە ئاوی ڕۆباران سوور
دەبێ و شێوەی ڕەنگی ئەرخەوان
دەدا .

**ئەرخەوانی** ــ ( ص.) ڕەنگی
وەکو ڕەنگی گوڵی ئەرخەوان،سووری
مەیلە و بنەوش ، سوورێکی ڕەش‌باو.

**ئەرخەیان** ــ [ تو.] ، ( ص.) ،
( مک.) دڵنیا ، خاترجەم :: ئەرخەیان
لێی بنوو ، ئەرخەیان بن هیچی بەسەر
نەهاتوە . ★ ئارخەیان .

**ئەرد** ــ ( نا.) تە : ئەرز .

**ئەردەڵان** ــ [ ئاردەڵ + ٢ ــ
ئان/٣ ] ، (نت.) ١ ــ ناوی
ئەمارەتێکی کوردە لە کوردستانی
ئێران پاتەختیان شاری (سنە) بوە.
٢ــ ناوێکی تری ئەم مەڵبەندەیە کە
لە تەشکیلاتی ئێراندا پێی دەڵێن :
( استان کوردستان ) . ★
ئاردەڵان .

□ « تەختی تەخت بوو ، بابا
ئەردەڵان »
« کەلاوەی کاول ، پەیکوڵ
بەردەڵان »
( پیرەمێرد ــ ٢٢٨ )

**ئەرز** ــ [= عا : أرض] ، (نا.)
١ــ کورەی زەوی ، ئەو ئەستێرەی
کە ئادەمیزادی لە سەر پەیدابوە .
٢ــ پارچەیەك زەوی کە تەرخان
کرابێ بکرێتە خانووبەرە :: ٨٠٠ مەتر
ئەرزی لە کارێزی مەجیدبەگ هەیە.
٣ــ هەموو خاکی وولاتێك :: ئەرزی
عێراق . ٤ــ هەموو زەوی‌وزاری
سەر بە گوندێك ::
ئەم دێیە ئەرزی کەمە ،
هەندێ جۆتێری ئەم ئاوایـیە ئەرزیان
بەرناکەوێ . ٥ــ تەختی ژوورەکانی
خانوو // مێچ ★ ئەرد ، زەمین ،
زەوی ، عەرد ، عەرز . **ئەرزی
مقەددەس** ــ (نت.) ١ــ جێگا
پیرۆزەکانی هەر دین و ئاینێك
:: **مەککە** ، **مەدینە** ، **قدوس** .
٢ــ (کن.) شوێنێکی یەکێك بوو
لێدانیشتن و هاتوچوو هەڵبژاردبێ و
زۆری دڵ پێوەبێ :: ئەوە بۆچی
دوکانی مامە حەمەت لێکردووین بە
ئەرزی مقەددەس . هەموو دنیای
لێ بۆتە ئەرزی مقەددەس و هەر
دەو قوژبنە دەخزێ ( گۆیا جێگاکانی
تر پیرۆزن نابێ لێیان
دانیشێ . ) . **بە ئەرزدا چوون** ــ
(مصد. لا.) ، (مک.) لەبەر چاوان
وون بوونی شتێ یا کەسێ بە
جۆرێکی پیاو لە گوم‌بوونەکەی
سەری سوڕبمێنێ :: نەمانزانی بە
ئەرزدا چوو ؟ ئاسمان هەڵیکێشا ؟ **بە
ئەرزدا دان** ــ (مصد. مت.) ، (مک.)
١ــ کەسێك یا گیاندارێك بە زۆر
( بۆ هەر مەبەستێ بێ ) لەسەر
زەوی درێژکردن :: مامە زاخە
چوارپەلی گایەکەی بەست و بە
ئەرزیدا دا و جێ‌بەجێ سەری
بڕی . ٢ــ لەزۆرەوانیدا بە سەر
کەسێکدا زاڵ‌بوون . :: کابرای
لەسەر سەری خۆی سووڕاند وەك
شوتی بە ئەرزیدا دا . ٣ــ بە
توندی و تەووژم شتێك یا کەسێك
بۆ سەر ئەرد فڕێ دان . :: کە
تۆڕە بوو هەرچی قاپ و قاچاغی بەر

دەست کەوێ بە ئەرزێدا دەدا . **بە ئەرزا کوتان** ــ (سیە.) تە : بە ئەرزدا دان . **خۆ بە ئەرزێدا دان** ــ (مصت. لا.) ١ــ خۆ خستنە سەر ئەرز . ٢ــ خۆ گیرۆکردن لە شوێنێك :: ئەوە دوو سەعات دەبێ لێرە خۆی بە ئەرزێدا داوە بە ئامان و زامن هەڵناستێ . **لە ئەرزێ دان** ــ (مصت. متە.) تە : بە ئەرزدا دان .

**ئەرك** ــ [ أ ] ، (نا.) ١ــ ئەنجامی هەر کار و کردەوەیەك ، کە یەك یا چەند کەسێك تووشی ماندووبوون و نارەحەتی بکا . زەحمەتی مەعنەوی :: بە ئەرکی مەزانە دەگەڵ دەستی خۆت ئەو کتێبەم بۆ بێنە ، ئەرکی بە خێوکردنی منداڵ ئەوەند گرانە هەر بە دایك قبووڵ دەکرێ ، ئەرکی جێبەجێ کردنی پێویستەکانی کۆمەڵایەتی لە شانان سووکە . ٢ــ (مجـ.) زەحمەت ، تەکلیف . □ « ... هیچ ئەرکێکم لەسەر تۆ نیە بۆچی دەرم دەکەی ؟ » (قزلجی : پێکەنین ــ ٩٤ ) . **ئەرك بەسەرەوەبوون** ــ حاڵەتی بەرەوڕووبوونی کەسێك یا کۆمەڵێك دەگەڵ کار و فرمانی زۆروزەبەندی خەڵك :: ئەرکی ئەم دێیە هەمووی بەسەر ماڵی برایمی حاجییەوەیە و هەرچی میوانە زۆر دە ماڵی وان دەکا .

**ئەرکان** ــ [ عا. ] ، (نا.) ١ــ پایە و کۆڵەکەی هەموو شتێك ، هەر شتێکی بە بێ ئەو ، کارێك یا مەسەلەیێك جێبەجێ نەبێ و سەر نەگرێ . :: ئەرکانی نوێژ ، ئەرکانی دەوڵەت . □ « زەعیف بێ خوانەخواستە ئیعتیقادت »

« بە ئایین و
بە ئەرکان و بە ئەتوار »

( رەزا ــ ٢٣ )

٢ــ ئەرکانی حەرب و کورت کراوەتەوە . :: ساڵی ئەرکانی ( ساڵێکە کە ئۆردووی عوسمانی لە ژێر فەرماندەیی برایم پاشای ئەرکانی حەربدا ، لە مەڵبەندی مەهابات دەگەڵ عروسان شەڕی کردوە ) . ٣ــ ناوە بۆ پیاوان . :: ئەرکانە شەلی نانەوا لە کانیسکان بوو . **ئەرکانی جەیش** ــ [عا.] ، (نتـ.) ، (کعر.) ئیدارەیەکە لە وزارەتی جەنگ یا بەرگرێ وولاتاندا ، لە وەختی شەڕ و ئاشتیدا فەرمان دەدا بە بەشەکانی هێزی چەکدار و چاوەدێری جێبەجێ کردنیان دەکا . ★ ئەرکانی حەرب ( لە دەوری عوسمانیدا ) ، (کێر.) ستادی ئەرتەش . **ئەرکانی حەرب** ــ [عا.] ، (نتـ.) ١ــ تە : ئەرکانی جەیش . ٢ــ هەر ئەفسەرێکی بە دانستە بۆ هەڵسووڕاندنی ئیشی دایەرەی ئەرکلنی حەرب پەروەردە کرابێ . □ « ئەرکانی حەربی هۆردووی شەشەمین »

« وەزیری عێراق محمد امین »

( سەلام ــ ١٩٥ )

★ (کێر.) ئەفسەری ستاد .

**ئەرك کێشان** ــ (مصت. لا.) جێبەجێ کردنی کار و پێویستێك

لەباتی کەسێك یا بۆ خۆ . :: ئەو ئەرکەمان بۆ بکێشە و تا مالی حەمەحەسەن بچو پێی بلێ با سەرێکمان لێبدا ، ئەگەر لەپێشدا تۆزێ وورد با ئێستا ئەو ئەرکەی نەدەکێشا لەسەرڕا بێتوسێتەوە .

**ئەرەفکێر** ـ (ئت.) تم : ئارەفکیر/١ .

**ئەرێ** ـ (ئە.) ١ـ بۆ پرسیارە و لە سەرەتای ڕستەی پرسیارەوە دێت . :: ئەرێ ئەوە شەوێ دێ بۆ نەهاتی ؟ ئەرێ تۆ نەتگوت کتێبەکەم بۆ دێنی ؟ هس : ئایا . تێب ـ ئەم ووشەیە بۆ پرسیارێکی تێکەلاو بە گلەیی و گازندەیە ، بەلام (ئایا) هەر بۆ پرسیاری ڕووتە . ٢ـ بۆ تەئکید . □ « ... ئەرێ وەللا ... کوڕم بە قەدەر تۆکی سەرت . » ( قەفتان : چیرۆك ـ ١٧ ) ★ ئاری/١ . ٣ـ بۆ سەرسوڕمان ( لەم حالەدا لە پاش ( ێ )کەوە سوکە دەنگێکی (هەمزە) ( دێتە گوێ ) .

□ « ئەرێ ئەی شێخە پیسی بۆری چلکن »
« ئەرێ ئەی زگ هەمانەی غازی بۆگەن »
( مەلا : گە ـ ١٩ )

**ئەرێونەرێ** ـ [ ئەرێ + و + نە + ئەرێ ] ، (کت.) دوودلی ، ڕاڕایی :: ئەم ئەرێ و نەرێیەت لە چیە ؟ زوو ئێشەکە ببڕەوە .

**ئەڕاگێل** ـ (صت.) ، ( هو.) حالی کەسێکی بە شوێن کەسێکا یا شتێکا وێلبێ .

□ « ئەرصاحێب شبەرتی ، شێرین ، وێل تۆم »
« بەیتەور موێنی ئەڕاگێل تۆم »
( خانا ـ ٢١٦ )

تێب ـ ئەم ووشەیە لە دوو کەرتی (ئەڕا) و (گێل) پێکهاتوە . بەلای منەوە یەکەمیان (ئەڕا) دەبێ (هەرا)ی ئاوێستایی بێ کە بەمانای کێوە و لە زمانی کوردیدا (هەلەت) و ( هەردە ) ی لێکەوتوتەوە ، دوەمیشیان ( گێل )ە لە مەصدەری (گێلان) بە مانای گەڕان و سوڕانەوە، بەتێکڕایی مانای ووشەکە دەبێتە : وێلی چۆل و بیابان .

**ئەڕتەش** ـ [= فر : ئەڕتێش] ، (نا.) تم : ئوردوو .

**ئەڕجۆ** ـ [ = عا : ارجو (تکادەکەم) ] تکا ، خواهیشت .

□ « ئەوەند ئەڕجۆ دەکا نالی کە جارجار »
« بکەن یادی موحیببی بێ ڕیاتان »
(نالی : کوڕ ـ ٣٢٠)

□ « ... شا بەسم لەسەر بکە ناز و ئەڕجووان ...» (تحفە : جا ـ ٢٠٤) .

**ئەڕزاق** ـ [= : ارزاق (رزق)] ، (نا.) تم : ئازوقە .

**ئەڕە** ـ (نا.) (جنو.) ئامرازێکی دارتاشییە ، لە ئاسن دروست دەکرێ ، دەمێکی ددان ددانی هەیە ، بۆ بڕینەوەی دار و تەختە و شتی تر بە کەلك دێت ، گەورە و بچوك و جۆر بە جۆرە . ★ مشار ، هەڕە ، (بکـ.) بڕەك (تم : ژابا ـ ٤٥ ،

کف ــ ١٢٠) .

**ئەز ــ** [ ست : ئەزێم ، پە : ئەز ] ، (ز.) ، (بک.) زەمیری پچــڕاوە بــۆ یەکەم کەسی مفرەد . تێبب ــ أ ) « تەنیا لە حاڵەتی فاعیلێدا ، بەلام بۆ زەمانی (ڕابردو)ی فیعلی متعدی دە کــارناکرێ [ هبێد ــ ٤٧ ] ، ب ) زیاتــر لە حاڵــەتی فاعیلێــدا بە کاردەبرێ ، پەهلــەوی ئەشکانییە [ فرەوشی : پفــا ــ ٦٣ ] ج ) لە مەڵبەندی لەهجەی ناوەندی زمانی کوردیدا لــە ناوچەی ڕەوانــدز و شنۆیە و دەوروبەریان هێشتا ئەم زەمیرە ، کەم و زۆر لە برەودایە و وەکــو ناوچـــەکانی دیـــکە لــە بیرنەچۆتەوە . د ) غەزەلێکی نالی کە شــەش شیعرە ، قافیــەکانی ( ئەز )ە و لە هێندێك مەتەڵۆکە و قسەی پێشینیانیشدا دەبیندرێ . □ « ئەزم هەڵدەبەزم » ، « ئەگەر دیتی ئەزم ، ئەیدێ دزم » .

« خاوی بێ خاوی دوو زوڵفی خاووم ئەز »

« چاوە چــاوی یەك غــەزالە چاووم ئەز »

( نالی : گە ــ ٢١ )

**ئەزبۆلە ــ** [ ئەز = ئاز + بۆ (بۆن) + لە (ئە : پچوکی ) ] ، (نت.) تە : ئەز بێ .

**ئەزبــەنێ ــ** [ ئــەز + بــەنێ (بەنــدێ) ] ، (نت.) ، (بکــ.) من بەندەی تۆ . تێبب ــ ووشەیەکە بۆ ڕێزلێگــرتن و بــە گــەورەزانێنی کەسێك ، لــە قســەکردنا بــەکار دەهێنرێ . ★ ئەز خولام ، ئەز گۆری ، قوربان .

**ئەزبێ ــ** [ ئەز = ئاز + بێ = بێن = بۆن ] ، (نت.) (سـ.) گیا و گوڵ و داو و دەرمانێ کە بۆ خۆش کردنی تــام و بۆن دەکرێتــە ناو چێشتانەوە ★ ئەزبۆلە ، هەزبێ ، هەزبێلە ، بەهارات. هس : ئازۆقە ، ئەزوا .

**ئەزخولام (غولام) ــ** (نتــ.) ، (بک.) من غولامی تو تە : ئەزبەنێ .

**ئەزگۆرێ ــ** [ ئــەز + گۆر + ١ــ ئی/٢ ] ، (نت.) ، (بک.) تە : ئەزبەنێ .

**ئەزمان ــ** [ پە : ئوزڤــان ] ، (نا.) ، (مەنگوڕایەتێ ، بک.) تە : زمان . (جنو.) زوان .

**ئەزمو ــ** (نمفـ : ئەزمــوون) تەجرەبــەکراو ، تاقیکــراوەوە . □ « دۆی ئەزمو لە ماستی نائەزمو چاترە » .

**ئەزموون ــ** [ ست : ئائیزما ، پە : ئازمــوتەن ] . (مصــت. متــ.) ، (باڵەکایەتی) تەجرەبەکردن ، تــاقی کردنەوە . □ « ... بێ ئــەوەی بمئەزموی » ، « چــۆن دەڵەی بەکار نایەی ؟ » .

**ئەزوا ــ** (نا.) ، (کنێر.) جەوێ یا شــێرەی گیایەکە ، لــە شوێنی گــەرم دەڕوێ ، ڕەنــگی زەرد یــا زەردێکی مەیلە و ڕەشە ، تامی تاڵ و ناخۆشە ، بــۆ دەرمانی(ڕەوانێ) و (کرم) و نەخۆشێ جەرگ بەکاری دێنن ، بۆ ڕەنــگ کردنی خوری و ئاورێشم کەڵکی لێوەردەگرن ، ئەم گیایە لە تیرەی گوڵە سوێسنەیە .

تیب ـ جاران لە کوردەواریێ بە ئەندازەی دەنکە نۆکێکیان دەپەڕە سێفارەوە دەپێچا ، وەکو (حەب) بۆ (ڕەوانی) و (سەفرا) قوتیان دەدا.
★ عا : صبر .

**ئەزەل** ـ [ = عا : ازل ] ، (نا.) زەمانێکی بێ سەرەتا ، ڕۆژگارێکی بێ ئەندازە کۆن . // ئەبەد .
□ « بڕۆ بیێنە : سەر لەوحەی قەزا »
« چێ بۆ لە ئەزەل ، نوسێ بەز لەبۆن »
(سەلام : خەییام ـ ١٠٢)
□ « سیاهەی دەفتەر ، میرزای ئەزەلەن »
« زیادێ و نوقسان ، ڕزق و ئەجەلەن »
(مەولەویێ : مکیێ ـ ٤٢٤)

**ئەزەلی** ـ [ عا. ] ، (صـ.) ١ـ صفەتێکە لە صفەتەکانی خودا :: بەو خودایەی ئەزەلی و ئەبەدییە.
٢ـ هەر شتێکی پەیدابونی سەرەتای نەبێ .

**ئەزیەت** ـ [ = عا : اذیة ] ، (نا.) ڕەنج ، ئازار ، زەحمەت
★ ئەزێت ، عەزێت .

**ئەزیەتخواردن** ـ [ عا. کو ] ، (مصد. لا.) تە : ئەزیەت کێشان .

**ئەزیەتدان** ـ [عا. کو.] ، (مصد. مت.) ١ـ ئێشاندنی لەشی کەسێك یا گیاندارێك بە لێدان و دارکاریێ و ئەو جۆرەشتانە .
٢ـ ماندو کردنی ئینسان یا هەر گیاندارێك ، بە کار پێکردن و هاتوچۆ پێکردن .
٣ـ چەوساندنەوەی کەسێك بە هەر جۆرێك بێ .
□ « جارێك من پێم ووت خۆتم نیشان دە »
« فەرموی نام بێنێ خوت، ئەزیەت مەدە »
( پیرەمێرد ـ ٤٢١ )
★ ئەزێتدان ، ئەزیەتکردن ، عەزێتدان .

**ئەزیەتکردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصد. مت.) تە : ئەزیەتدان .
□ « وە یادت مەیێ شەوەکەی لێو جۆ »
« ئەزیەتکردن من ، مەکە و لاوەی تۆ »
( فۆلکلۆر )

**ئەزیەتکێشان** ـ [عا. کو.] (مصد. لا.) قبوڵکردنی ڕەنج و ئازار ، ماندوبون ، خۆ ماندوکردن بە کارێکەوە یا بە کەسێکەوە . :: تۆ خوا ئەزیەت مەکێشە بگەڕێوە . ★ ئەزیەت خواردن ، ئەزێت کێشان ، عەزێت کێشان

**ئەزێت** ـ [عا.] ، (نا.) تە : ئەزیەت □ « ... لە پاشا لەوانە بۆ بشمزانیایە ئاگادارم نەکردنایە ، بۆ ئەوەی تۆشی ئەزێتی بە پیرەوە هاتنتان نەکەم . » (ـ : ژان ـ٢٧) .

**ئەزێز** ـ (صـ.) تە : ئازێز .
□ « یا ڕەب گوزەران کا بە سەفا وەختی ئەزێزت »
« پەیوەستە لە دەوری چەمەن و گەردشی باغا »
( ڕەزا ـ ٣ )

**ئەژدەها** ـ [ست: ئەژیدەهاکە] ،

(نـا.) ١ــ مــاری زۆر گــەورە . :: مارێــکمان کــوشت ئەژدەهایەك بۆ بۆ خۆی . □ « مار ماری نەخوا نابێتە ئەژدەهــا » ٢ــ مەوجودێکی خەیاڵییە لە چیرۆکەکانی کوردیدا زۆربــاسی دەکرێ ، وەکو مــارێکی یەکجار گەورە وایە ، شاخی هەیە ، چاوی وەکو ئاگر دایێسێ ، کە دەم دەکاتەوە گڕی لێ دێتە دەر ، لــە دوورەوە پیــاو هەڵدەلوشێ ، گۆیا پاســەوانی خەزێنــــە و گەنجــی شاراوەیە □ « ... ئەژدەهایــەك بەری ئاوەکــەی گرتبــو ، پاتشــا کوتی هەرکەس بێ کوژێ کچی خۆمی دەدەمێ ... » ، « ڕەببی ئەژدەهای حەوت سەر بچێتە خەوێ » .

« حەلقــە حەلقــە زولفــی بەر
قوبەی هەیاسەی کەوتوە »
« مەحــرەمی سیڕرە ، بــەڵێ
گەنجوری گەنجە ئەژدەها »
(نالی : گە ــ ١١ )

٣ــ (مجـ.) ، أ ) ئینسانی زۆر خۆر . ب ) ئافرەتی دز و بێشەرم . ج ) پیاوی زۆر ئازا ★ ئەژدیها ، هەژدەهــا ، هەژدیهــا . تێبـ ــ ئاوێستاییەکەی ئەم ووشەیە لە دوو کەرت پێکهاتوە : (ئەژی) بە مانای مار کە هەر بەم شکڵە و مانایەش هاتۆتە نــاو (پەهلەوی) . کــەرتی دوەم (دەهاکە) لە ڕێشـــەی ( دەھ ) بە مانای : ئەوەی ئازار دەگەیێنێ ، پێوەدەدا . (تە : معین ، بورهان ، جا ــ ١١٦ ) .

**ئەژدیها** ــ (نا.) تە : ئەژدەها .

**ئــەژمــار** ــ ( نــا . ) کــاری دیاریکردنی چەندێتی هەر شتێك بە گوتنی : یەك ، دوو سێ ...و... ، ئەنجامی ژماردن . :: گونیەکانی بە ئەژمار تەسلیم کەن، لەشکرێکی هێند زۆرە دە ئەژمار نایە . ★ ژمــار ، ژمارە/١ ، ئــەژمارە ، هــەژمار ، حیســاب ، حیسـاو ، حیسێب .

**ئەژماردن** ــ [ پە : ئۆشمورتەن ، ئۆشــمارتەن ] ، ( مصــ . متــ . ) دیاریکردنی چــەندێتی شــتێك ، حیســابکردن ، گوتنی یەك ، دوو ، سێ ...و... هــەر جــارە لادانی پارچەیەك لەو شتەی مەبەســت بێ بزانن چەندە.::هێشتا نەتئەژماردوە دەڵەی ئەوەندەیە ، ئەوە سێ جارە دەیئەژمێرم یەکێکــی هەر کەمــە .

□ « خــاڵم ئــەژماردن ضــەت و
بیســت و نــۆ »
« هیــچ خــاڵم نــەدی لــــە
گوێن خــاڵی تــۆ »
( فۆلــکلۆر )

★ بژاردن/١ ، ژمــاردن ، (بکـ .) هەژمارتن ، حیساب ، حیسێب ، حیسێو (کــردن) ، (جنو.) ژمارە کردن . حەساوکردن

**ئەژمارە** ــ [ئەژمار+ ە ــ ئە/١]، (نا.) تە : ئەژمار . □ « ... بە پێی ئــەژمارە بۆ گشــت مامرێــکی سەرە ، پانزە هێلکە لە ڕەشاییەکان ئەسێنێت...» (قزلجی : پێکەنین ــ ١١٨ ) .

**ئەژماردە** ــ ( نمف : ئەژماردن ) شــتێکی زانــدرا بــێ چــەندە ، حیســابکراو . :: پــارەکەی بــە ئەژماردە لێوەرگرن . ★ بژاردە ،

ژمارده .

**ئەژنۆ** ــ [ پە : شنوك ، زانوك ] ، (نـا .) ئەندامێكی لەشـی هـەندێ گیاندارانە ، ئەو جمگەیە كـە ڕان و لاق پێكەوە دەبەستێ . ★ چۆك ، زرانێ ، زەنگۆڵ ، ووژینگ ، هەژنۆ . ( ستـ : ژنو . تە : ژابا ــ ٨ ) .

**ئەژنۆپێدادان** ــ (مصتـ . متـ .) ، (كنـ.) بەردەسـتكردن ، ڕامكردن هێنانەبەربار . :: سـۆك و هاسان ئەژنۆی‌پێدادا ، ئۆردۆی سـۆر لـە ستالینگراد ئەژنۆی بەهیتلەر دادا★ چۆك‌پـێ‌دادان . هـس : ئـەژنۆ دادان/٢ .

**ئەژنۆدادان** ــ ( مصـتـ . لا. ) ١ــ بە نیشانەی ئەدەب ، لای یەكێك یا لەمەجلیسێك لەسەر چۆك‌دانیشتن :: ئەژنۆی دادا و نامەكەی دا دەستی ٢ــ (كنـ.) تێ‌شكان ، مـەغلوب‌بۆن . تێبـ ــ لـە پێشدا بـۆ زۆرانبـازێ داكەوتوە و ئەژنۆ كەوتنە سەر ئەرز، هـەروەها پشـتیش نیشـانەی ژێركەوتنە ، پاشان بۆ هەمۆ جۆرە تێ‌شكانێك بۆتە باو ★ چۆك‌دادان .

**ئەژنۆشكان** ــ ( مصـتـ . لا. ) ١ــ شكانی چۆك . ٢ــ (كنـ.) بێ‌هێز بۆن، بێ دەستەڵات بۆن،بێچارە بۆن ● « ئەی ئەژنۆ شكاو خۆ . . . » ، بێچارە ، بێ دەستەڵات خـۆ . . . ( زیاتر كەس و كاری مردۆ بە كاری دێنن ) ، « ئەی بـە ئەژنۆی شكاو بێتەوە » نەبێتەوە . ( یەكێك چۆبێتە شوێنێك و زۆری پێ‌بچێ ، ئـەوی لەم درەنـگ هاتنـەوەیە تـۆڕە بێ دەیڵێ ) .

**ئەژنەفتن** ــ [ پە : ئاشنوتەن ] ، ( مصـ . متـ . ) ، ( جنـ. ) تە : بێستن ★ ئەژنەوتن، ژنەفتن . تێبـ ــ (ژ)ی ئەم ووشەیە لە ئەسڵا (ش)ە و لەبەر جێرانەتێ (ن) دەنگی (ژ) دەدا .

**ئەژنەوتن** ــ ( مصـ . متـ . ) تە : بێسـتن .

**ئـەژێ** ــ ( فـە . ) ، ( جفـ . ) دەهێنێ ، دێنێ ، بایێ ئەوەندەیە . تێبـ ــ ئەم ووشـەیە سێغەی مفرەدی غایببی مەصدەرێكە ، كە لە لەهجەی ناوەندیدا لەبێر چۆتەوە و تەنیا ئەم سێغەیە و شـێوەی ( نەفیی )شـی (نائژێ = نائەژێ) لێ‌بەجێ‌ماوە ، لە لەهجەی باكۆرێدا وەك (نفا.،صفا.) لـە قـالبی (هێـژا ، نەهێـژا )دا دەبێنرێ و مەصدەرەكەی (هێژیان، هیژیان ، هیژێـن )ە ( تە : ژابـا ــ ٤٤٣ و ٤٥٧ ) ، بەم پێیە دەبێ لـە لەهجەی ناوەندیدا (ئەژیان) بۆبێ و دۆرێـش نیـە (ئەرژیـان)بێ كـە ئێستاش لە لەهجەی جنۆبیدا لـە قالبی ( ئەرزیـان )دا دەی‌بێنێـن ، ئاوێـتـایێ ئـەم مەصـدەرە (ئەرێجـەت) و پەهلەویەكەشـی ( ئەرژێتەن)ە (تە : پد ، یگد، جـ ٢ ــ ٣٤٢ ) .

□ « هەربەك پەلی فرزەندێ دەژێ (دەئەژێ) شیعری حەرێقـی »
«تۆ بۆچی لە كیس خۆتی دەدەی مشتەری نـادان »
( حەرێق )

**ئەسارەت** ــ [=عا : أسارة] ، ( مصـ. متـ.) تە : ئێخسیرێ .

**ئەساس** ــ [=عا : أسـاس ] ،

(نا.) پایە ، بناغە .
□ « دڵە بۆ شێوەن کانگە و
ئەساسی »
« بە بێ کۆس کەوتن
بازاڕکەساسی »
( سەلام ــ ١٨٧ )
**ئەساسێ ــ** [ عا.] ، ( صـ.) ١ــ هەر شتێکی پەیوەندێ بە بناغەی کارێك یا شتێکەوە هەبێ :: قانۆنی ئەساسێ ٢ــ بەشێك لە کارێ یا مەسەلەیێ کە لە بەشەکانی تر کارێگەرتر بێ ، موهیم تر بێ .
**ئەساسییە ــ** [ عا : أثاث ] ، (نا.) ، (کێر.) کەڵوپەلی ناوماڵ ، هەرچێ بۆ ئاوەدانکردنەوەی ماڵ پێویست بێ ( ڕایەخ ، پێخەف ، ... ، ... ) ★ ئەسپاب/٣ .
**ئەسپ ــ** [ ست : ئەسپە ، پە : ئەسپ ] ، ( نا.) ١ــ گیاندارێکی چوارپێی، بەرزی ، یەکسمی، کلك و یاڵ درێژی ، شۆخ و شەنگی ژێرە . لە زۆر کۆنەوە کەویکراوە ، بۆ سواری و بارهەڵگرتن و غارە ئەسپ و گۆیێن بەکاردێت ، ٢٥ ــ ٣٠ ساڵ دەژێ ، هەر پاش کەویکردن هاتۆتە ڕیزی ئامرازی شەڕی نێوان خێڵ و عەشیرەتەکانەوە، ئێستاش لەشکری دەولەتەکان بەشێك سەربازی سوارەی هەیە ، ڕاگرتنی ئەسپ لە کوردستان دەگەڕێتەوە ڕۆژگارێکی کۆن ( دەوریمادەکان ) و بەخێوکردنی سەرچاوەی داهاتێکی باشە بۆ خاوەن ڕەوە ئەسپان، گەلێ ڕەنگی هەیە : کوێت ، شێ ، ڕەش بۆر ، سورخن ★ (بك.) هەسپ ، هەسپێ نێر ( تە : کف ــ ٣١٤ ) . ٢ــ یەکێکە لە داشەکانی یاری شەترنج . **ئەسپی باوبۆران ــ** (نت.) ئەسپێکی خەیاڵییە لە چیرۆکە فۆلکلۆریەکانی کوردیدا باسی کراوە، گۆیا وەکو (با)و (بۆران) بە تەووژم و خێرایە . **ئەسپیبەحرێ ــ** ( نت. ) مەوجودێکی خەیاڵییە شکڵی وەکو ئەسپ وایە ، لە هێندێك چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا ناوی دێ ، گۆیا لە بەحرا دەژێ و بۆ هەندێ پاڵەوانی ئەم چیرۆکانە دێتە دەر و سواری دەبن ، زۆر خێرایە دەگەڵ ئەو گیاندارەی کە زانستی ئیمڕۆ بە ئەسپی ئاوی دادەنێ [=هیپپۆپۆتام] لێكجودان . **ئەسپی ڕەش ــ** ( نت.) بەیتێکە لە بەیتە فۆلکلۆرێکانی کوردێ ، بە دۆ لەهجەی ناوەندێ و باکوری . **ئەسپیحەوۆد ــ** ( نت.) ، ( مک.) ئەسپی ڕەسەن ، ئەسپێ ڕەگەزی بچێتەوە سەر ئەسپی عەرەبێ ★ (سیم.) عوبێدە . کەحێلە ، کەحێلان .
**ئەسپاب ــ** [= عا : اسباب ( سبب ).] ، (نا.) ١ــ تە : ئامراز/١
□ « جۆشێك بدەن وەکو هەنگ ،
تەگبیر بکەن بە بێ دەنگ »
« ئەسپابی شەڕ پەیاکەن ،
تۆپ و تفەنگ و هاوان »
( حاجێ : گە ــ ٥٢ )
٢ــ مایەی جێبەجێبون و نەبون یا ڕۆدانی کار و بەسەرهاتێك :: ئەسپابی ئەم تێشکانە دەبێ چێ بێ ؟ . ئەسپابی زێزبونەکەی تێ

نەگەیشتێن ★ سەبەب ، عیللەت ، هـۆ . ٣ــ تمـ : ئەساسـییە . ٤ــ (مک.) هەمـوو ئەو کالآیـەی لە دوکانێـکدا دادەنـدرێ بۆ فـرۆتن ★ خرت‌وپرت . ٥ــ (مج.) (مک.) ئامـرازی پیـاوەتی ئادەمیـزاد . ★ ئـامراز ، (سـنـ.) ئەسـپاو ،

**ئەسپاو** ــ [ نا.] ، ( سنـ.) تە : ئەسپاب .

**ئەسپاردن** ــ[پە: ئەپەسپارتەن]، ( مصد. متـ.) ١ــ کارێك حەوالـەی کەسێك کردن بۆ جێبەجێ‌کردنی .
□ « قوربانت بم چاو ئەسـتێرە »
« خزمەتێکمان پـێ بسپێرە »
( فۆلکلۆر )
٢ــ تەسلیم‌کردنـی شـتێك بـە کەسێك، کە بەئەمانەت هەڵێ بگرێ و ئاگای لێ بـێ . □ « بـە خـودام ئەسپاردن » ، «تو دەرۆی ئێمە بەکێ دەسپێری» ٣ــ تەمێ‌کردنی کەسێك بۆ کردن یا نەکردنی کارێك. :: بـە دەرکەوانەکەی ئەسپاردبو ڕاگیرمان نەکا ، ئەسپاردوویە هەر کەس بچێ بڵێـن لـە مـاڵ نیـە . □ « . . . ئەسپـاردی لە پێشخـانە ، بـەك دوبەرەیان ڕاخسـت . . .» (قزڵجی: پێکەنێـن ــ ١٤١ ). ٤ــ (مجـ.) شاردنەوەی مردو :: بە خاکیمـان ئەسپارد . ★ تەسلیم‌کردن . هس: ئەسپاردن/٢ . ★ سـپاردن ( بۆ هەر ٤ مانـاکە ). **ڕائەسپـاردن** ــ [ ڕا (پێبف.) + ئەسپاردن ] ، (مصتـ. متـ.) ١ــ ناردنی پەیام یا خەبەرێ ، بە کەسێکدا بۆ یەکێکـی تر :: بـە خدردا ڕای‌ئەسپارد بۆ سـەرێکی لێ بدەین . بـە دەمیـش تۆفێقمـان ڕائەسپاردوە ، ڕادەسپێرێن بە مام کوێخـا بڵێـن . ٢ــ داوای جێبەجێ‌کردنی کارێك لە کەسێك :: پێرۆتمـان ڕائەسپـارد لە شـار غەزەتەمان بۆ بێنێ . ★ ڕاسپاردن. تێب ــ کەرتی یەکەمـی ئەسـپاردن (ئە) زۆر شل و شەوێقە هەندێ جار لە قسەکردنا دەردەکەوێ و هەندێ جاریش وون دەبێ و شێوەیێکی‌تری مەصدەرەکە ( سپاردن ، ڕاسپاردن) پەیدا دەکا ، بـەڵام ئەسـڵ هـەر ( ئەسپاردن )ە.

**ئەسپاردە** ــ (نمف. صمف.) هەر شـتێکی بە کەسـێك درابـێ بـە ئەمانەت. :: ئەسپاردەی‌خواین ★ ئەسپەردە ، ئەسپێراو ، سپاردە ، سپێراو ، سپێرپاك .

**ئەسپایی** ــ [ئەسپا + ٢ــ ئی] ، (حمصـ.) بێ هەست و خوست ، بێ تەقە و ڕەقە ، لەسەرخۆ ، بێ دەنگ . تێب ــ ١ ) ئـەم وشـەیە هەمیشـە ( بە ) ی لە پێشەوە دێت و بە تەنیایی مانای نایە . ب ) ئەسپا لە (ئاوێستا)دا لە دوکەرتی : (ئـە = ئامـرازی نـەفی ) و (سـپا) پێکهاتوە ، (سپا) بە تەنیایی یەعنی : خۆشی ، بەختـەوەری ، لێ زیاد کردن ، بردنـەپێش ، فرێـدان ، تۆڕدان لە گەڵێ شوێنی (ئاوێسـتا)دا دەکار کراوە و لە بەندی ٩ی هاتی ٥٤ی (یەسنە)دا ، سپا و ئەسپا بە مانای بەختـەوەری و چـارەڕەشی پێکەوە هاتون و (ئەسپا) بە مانای ئێش و ژان هاتوە (تە : پد . یگد ــ

١٩٦) . **بە ئەسپایی** ـ (بنت.) بە بێ دەنگ ، بە لەسەر خۆیی ... :: بە ئەسپایی دەرگاکە پێوەدە با منداڵەکە وەخەبەر نەیێ ، بە ئەسپایی بە گوێیدا چرپاند ، بە ئەسپایی هاتە ژوور .

□ « بۆ سەر ئەم خاکە پێ بە
ئەسپایی »
« دانێ ، چاوەکەم ، چاوی
یاری بۆ »
(سەلام : خەییام ـ ٨)

★ ئاسپایی ، بەئاسپایی .

**ئەسپسوار** ـ (صت.) کەسێکی سواری ئەسپ بێ ، نەك وولاغی تر .

□ « من پلاوخۆرم بە دۆ تێر
نابم »
« من ئەسپ سوارم بە کەر فێر
نابم »
(پیرەمێرد ـ ٢١٤)

**ئەسپنگ** ـ (نا.) تمـ : ئەسپینگ.

**ئەسپۆن** ـ (نا.) گیایەکە لە نوالآن دەڕوێ ، لق و پۆپی بارێك و ساقەتی ئەستوورە ، مالات نایخوا . ڕەگەکەی ووشك دەکەنەوە و لە دەستاڕی دەکەن جلی پێ دەشۆن .

□ «کوردە ! ئەسپۆنەکەت ووردە ؟» هس : صابۆن ( لە بەشێکی زۆری زمانە ئوڕوپاییەکانیشدا ) .

**ئەسپەئاسنینە** ـ (نت.) تمـ : ئەسپەدارینە .

**ئەسپەدارینە** ـ [ئەسپ + ٣ـ ئە/٢ + دار + ئینە ] ، (نت.) ، (مک.) مەکینەیەکە ئینسان سواری دەبێ و هاتوچۆی پێدەکا ، دوو تەگەر (تایە)ی هەیە بە هۆی زنجیرێکی تایبەتی کە چەرخێکی ددانە داری پێوەیە ، دەسوڕێنەوە . تێب ـ لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا باسی ئەسپێك دەکرێ کە لە دار دروستکراوە ، یەکەم جار کە ئەم مەکینەیە هاتوتە موکریان ، لە ( مەهابات ) پێیان کوتوە : ئەسپەدارینە ، هەروەکو کتێبەکانی پێش شەڕی دوەم کە لە عێراق بۆ خوێندنی کوردی چاپکراوون بە (ئەسپەئاسنینە)یان ناوبردوە . ★ (کعر.) پایسکل ، (کئیر.) دووچەرخە .

**ئەسپەر** ـ (نا.) ، (سن.) تمـ : ئەسپەرە .

**ئەسپەردە** ـ (نمف. ، صمف.) ، (سن.) تمـ : ئەسپاردە .

**١ـ ئەسپەرە** ـ [ أ ] ، (نا.) ١ـ پارچە دارێکە (٢٠) سانتی مەتر درێژ و پێنج سانتی مەتر ئەستوور دەبێ ، پاش لێك و لووس کردن و تاشینی ڕوویەکی پان و ڕاست و لایەکەی تری لە ناوەڕاستا ئەستوورە ، وورده وورده بە ڕاست و چەپا تەنك دەبێتەوە ، کونێکی خڕی تێدەکرێ و دەخرێتە سەر دەسکەبێل و پێمەڕە ، لە وەختی ئێشا قاچی دەخرێتە سەر تا پێمەڕەکە هاسانتر و خێرا تر لە زەوی بچێتە خوار و ئەوەندەش پێویستی بە هێزی دەست نەبێ . ٢ـ پارچە دارێکە دەخرێتە بەینی مێچ و کۆڵەکەی خانوو ، تا ئەو

شوێنــەی مێچی دەکەوێتــە سەر تۆزێ پانتر بێ و قورسایی مێچەکە دابەش ببــێ . تێب ــ وا دیــارە ئەسڵی ئەم ووشەیە (ئەسپارە) بێ و لە (ئەســپاردن) داتاشــرابێ . ژابا ( ئەســپارەبۆیین ) ئــاوا مەعنــا لێدەداتەوە : پاڵدانــەوە بە سەر کەســـــێکدا ، کۆمــــــەگ و پشتیوانیکـــــردنی یەکێـــــك ، هەڵپەســـــاردنی شـــتێك بـــە شتێکیتــرەوە ، قـــەوەت و زۆر خستنە سەر شــتێك . (تە : ژابا ــ ٨ ) .

**٢ــ ئەسپەرە** ــ (نا.) ، (سنـ.) گیایەکە بەنی پێ زەرددەکەن (تە : هبێـــد ــ ٤٥ و مخـ ــ ٥٢ ) . هس : (فر.) ئەسپەرەك هەر بەم مەعنایە ★ زەرتك ، گێنۆ .

**ئەسپەشـێنە** ــ [ ئەســپ + ٣ــ ئە/٢ + شێن + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت.) ، (ســیمـ.) « باڵنــدەیەکی ڕەنگاوڕەنـــگە ، لـــە کەڕەواڵـــە گەورەترە ، لـــە کـــاتی هەڵفڕینـــا دەنگێکی لێوە دێ لە حیلەی ئەسپ ئەچـــێ » (خـــا : جا ــ ٤ ) ، « زەردەواڵەخۆر ــ باڵندە » (هبێد ــ ٤٥ ) ★ (مک.) کاسەلەشێنکە .

**ئەسپەك** ــ [ ? ] ، (نا.) زیپکە و ( لێـــر )ێـــکی بەهـــۆی نەخۆشـــێ کەوتۆیێ (تیفۆس) لەشی ئادەمێزاد بەتایبـــەتی ســـــەر ، دەرێدەدا . هس : (ستـ.) ئەســپا = دەرد ، ئازار . **ئەسپەك لەسەر (یکەسێ) دان** ــ شێتبۆن بەهۆی نەخۆشی ڕەشەگرانەتێ . تێب ــ ڕەشەگرانەتا کە تۆشی یەکێك بۆ ، کار لە هەمۆ دەزگاکانی لەشــێ دەکا ، یەکێــك لەوانــە سەر و مێشــکێتی ، لەو حاڵـــەدا نەخۆشــــەکە قســـــان دەڕاوێنێ و ئەگەر نەیکوشت شێتی دەکـــا ، ئــەو وەختــە دەڵێــن : « ئەسپەك لە سەرێ داوە » .

**ئەسپەناخ** ــ (نــا.) ، (کعر.) تە : ئەسپەناغ .

**ئەسپەناغ** ــ (نــا.) ، (مکــ.) گیایــەکی بەهــارێ دەشــتەکییە ، گەڵای پانە و لاسکی بارێك و شلکە ، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە چۆتــە ئەوروپا (تە : لاڕۆس ــ ٣٨٨) ئێستا دەسچێنێشـــی هەیـــە . تێب ــ لـــە کوردستان ئەم گیایە بە گەلێ جــۆر دەخورێ : دەگـــەڵ هێلکە دەڕۆنـــا سۆریدەکەنەوە ، زەردیدەکـــەن و ماستی بەسەردا دەکـــەن ، دەگـــەڵ گۆشت خۆرشتی لێدروستدەکرێ . (کعر.) ئەسپەناخ .

**ئەسپەندەر** ــ [ ئەسپەند + ٢ــ ئەر /٢ ] ، (نت.) گیایەکی دەشتەکییە گەڵای خڕ و پچکۆلەیــە و لاســکی بەقەد قامکێك ئەســتۆرە ، ڕەنگــی زبـــاتر (کەوە)یە تـــا ســـــەوز ، بەرێكدەگرێ هێندەی دەنکە نۆکێ ، ناوەکەی پڕە لە تۆوی ڕەشی وورد. تێب ــ أ) بەری ئەم گیایە بە شێنــێ کۆدەکەنەوە و بە دەزۆیەوە دەکەن و بەناو ماڵا هەڵێداوەسن هــەم بــۆ ڕازاندنــەوەی ژۆر و هـــەم بــۆ ئیشك‌کردنەوەی. ئەم دەنکانە دەگەڵ (کوندر) و (هۆشە) یا بە تەنیا دەخەنە سەر هەندێ پشکۆی ئاگر و بەنــاو

مالا دەپکێزن تا دۆکەڵ و بۆنی دەماڵ بکەزێ ، دەڵێن بۆ (چاووزار) باشە و گۆیا مار و دۆپشکیش لە بۆنی گیایەکە و دۆکەڵی دەنکەکانی دەرەونەوە . ب) بە لای منەوە ئەم ووشەیە لە (سپێنتە)ی ئاوێستایی بە مانای : پاك ، مقەددەس ، ( تە : پد . بگد . ج٢ ـ ١٤٥) و (ئەر) ئامرازی فاعیلی پێکهاتوە کە بە تێکڕایی ماناکەی دەبێتە (پاککەرەوە- مطهر) ، وەکو باسکرا ئێستاش لە کوردەواری خۆمان بۆ دورخستنەوەی زیانی چاووزار (خاوێنکردنەوەی ماڵ لە چاوی پیس ، بەکاریدێنن) . ج) زۆر بۆ ئەوە دەچم کە لە پێش ئیسلاما ئەم گیایە لە ئاتەشکەدەکانی دێنی زەردوشتی وەکو ( بخور ) بەکارهێنرابێ . .

**ئەسپیندار** ـ [ئەسپێن + دار]، (نت.) جۆرە دارێکە ، توێکڵ و دارەکەی سپییە ، درێژ و ڕاست هەڵدەچێ ، گرێوگۆڵ و خوار و خێچی تێدا نیە ، بۆ کاروباری دارتاشی و دارەڕای خانو کەڵکی لێوەردەگیرێ و کاغەزیشی لێ دروستدەکرێ . هس : ئەسپێن .

**ئەسپینگ** ـ [ ؟ ] ، (نا.) ، (مک.) گیایەکی دەشتەکی بەهارییە ، گەڵای بارێكودرێژ و گرنجگرنجە ، لە چیا و دەشتی کوردستان زۆرە ، بە خوێوە دەخوری . ★ ئەسپنگ . (کعر.)شنگ .

**ئەسپێ** ـ [ست. و په: سپیش]، (نا.) ١ـ زیندەوارێکە لەبەر پیسوپۆخڵی لە لەشی ئینسان و هەندێ گیانداری تر وەکو (مەیمون و...)دا پەیدادەبێ ، ژیانی بە خوێنی ئادەمیزادە ، زۆر جێگەی مەترسییە ، چونکو میکرۆبی هەندێ نەخۆشی وەك (تیفۆس) دەگەڵ خۆی ڕادەگوێزێ ، دۆسێ میلی مەتر درێژدەبێ ، قاچی زۆر و کورتن ، سەری درێژۆکەیە ، دۆجۆری هەیە، یەکیان لەناو (مو)دا وئەوێتریان لەناو جلکاندا دەژێ . ئێ ناو جلکان گەورەترە لە هێ توك ، گەرای هەر دۆك جۆری وەکو یەك وایە (ڕشك)ی پێدەڵێن کە لە بنی توك یا درزی درۆمانی جلکدا دایدەنێ ، پاش چەند ڕۆژێ بەچکەکانی (مێتولکە) لە گەرا دێنەدەر و دوای ٢٠ ڕۆژێك وایان لێدێ خۆیان گەرا دابنێن . ٢ـ زیندەوارێکی پچۆکە لە گەنم و جۆ ، برنج و ئارد و ئەو شتانە دەدا، بێپێزیان دەکا و کەڵکی خواردنیان پێوە نایەڵێ . ٣ـ جۆرێك زیندەوارە لەژێر پەڕی مریشك و کۆتر و هەندێ باڵندەی تریشدا پەیدادەبێ و خوێنیان دەمژێ ★ مۆریان ، زیندەوار . ( بک. ) سپێ . ( هو. ) هەشپشێ . ● **ئەسپێی چەنگی گوڵ** ـ (کن.) پێسکەیێ ، ڕژدێ ، ڕەزیلێ . ∴ هەر دەڵەی ئەسپێی چەنگی گولییە لە دەستی دەرنایە . هەرچێ کەوتە دەست ئەحە دەبێتە ئەسپێی چەنگی گول . **ئەسپێ لە گیرفانێیدا ( باخەڵیا ) سەوزەڵە گیانم دەڵێ** ـ (کن.) هێچ

پارە و پوولی لە باغەڵیدا نیە ، زۆر فەقیر و نەدارە . تێب ــ دەڵێن ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی گولی دەبن، ئەسپێ هەڵناهێنن، جا ئەگەر کابرایەکی گوڵ ئەسپێیەکی لە خۆیدا دیت بۆ ئەوەی پیشانی بدا گول نیە یا چاکبۆتەوە ، ڕای‌دەگری و لە چەنگی نایەتەدەر .

**ئەسپێ تێ دان ــ** (مصد. لا.) ، (کمر.) پەیدابوونی ئەسپێ لە لەشی ئینسان و ... دانەوێڵەدا :: چاڵەگەنمەکەی ماڵی کوێخا شەریف ئەسپێ تێیداوە ( ئەسپێی تێداوە )، ئەم کابرایە بۆتە کەوڵەسپێ (کەوڵەئەسپێ) بڕۆشی ئەسپێ تێیداوە . ★ ئەسپێ هەڵهێنان .

**ئەسپێراو ــ** (نمف. ، صمف : ئەسپاردن) تە : ئەسپاردە .

**ئەسپێ‌کوژە ــ** [ئەسپێ + کوژ (کوشتن) + ٣ــ ئە/٢] ، (نتــ.) . پەنجەی هەرە ئەستوور و لە هەموان کورتتری دەستی ئینسان . ★ قامکە گەورە ، پەنجەی گەورە .

**ئەسپێون ــ** [ئەسپێ + ئن] ، ( صتـ.) ئەو کەسەی ئەسپێی لە لەشی دابێ .

**ئەسپێ هەڵێنان ــ** [ ئەسپێ + هەڵ (پێبف.) + هێنان ] ، (مکـ.) تە : ئەسپێ تێ‌دان .

**ئەسپێن ــ** [؟] ، (نا.) ، (با.) ١ــ پارچەدار یا ئاسنێکی نووکتیژە بە شکڵی دەمەتەور ، بۆ قەڵاشتنی دار و بڕینەوەی تەختە و ... بەکاردێت ، کاری ئەوەیە نایەڵێ قەڵشتی دار و تەختەکە وێک‌بێتەوە و ڕێگای ئتش‌کردنی تەور یا مشار بگری . هەروەها کەوشدروو بۆلێک دوورخستنەوەی لەتەکانی قالبی کەوش کەڵکی لێ‌وەردەگرن . هس : أ) سپینج = دەمەشێر یا چەقۆ ( عا : نصل ) ، (تە : ژابا ــ ٢٣٤) ب) سفین (اسفین) عارەبیێ هەر بە مەعنای (ئەسپێن)ی کوردیێ ، لە یۆنانێ وەرگیراوە ( تە : المنجد ــ ٣٣٨) ، ج) سپێنای لاتینی = درز . ★ پواز ، سپێنە ، هۆرە . ٢ــ کۆلەکەیەکە وەبەر دیواری شکستی دەدەن تا نەیەڵێ بڕووخێ .

**ئەستاندن ــ** [ پە : ستەتەن] ، ( مصد. متــ.) ، (مکـ.) شتێک بە زۆر وەرگرتن :: هەردەی‌ئەستێنێن بۆ کوێ دەچێ،دەمێکە ئەستاندوویە و دەنگی نەکردوە .★ ساندن ، سەندن ، سەنن . **لێ‌ئەستاندن ــ** ( مصد. متـ.) شتێک بە زۆر لە کەسێک وەرگرتن ، بە تۆبزێ لە دەست دەرهێنان :: هینند قیزسیچمەیە بە زۆر و بەخواهیشت شتێکی هەر لێ‌دەستێنێ ، زۆری هاوارکرد فایدەی نەبوو ئاغاسەت تمەنی هەر لێ ئەستاند . ★ لێ‌ساندن ، لێ‌سەندن ، لێ‌سەنن .

**ئەستاندنەوە ــ** [ئەستاندن + ــ ئەوە ] ، (مصد. متـ.) ، (مکـ.) ١ــ وەرگرتنەوەی شتێک لە کەسێک . تێب ــ ئەم مەصدەرە نێمچە زۆرێکی لە مەدلولەکەیدا بەدی‌دەکرێ . :: هەر هەڵنەستام تا تەسبیحەکەم ئەستاندەوە . تا پارەکەت نەستێنیوە

وازنەهێنی . ٢ـ گرتنەوەی شار یا هەر شوێنێکی‌تر کە دوژمن داگیری‌کردبێ . :: ئۆردوی سۆر هەمۆ ئۆروپای لە دەست نازییەکان ئەستاندەوە . بۆ **ئەستاندنەوە** ـ ( مصت. لا.) ١ـ وەلام‌دانەوەی گۆرانی‌بێژێك لەلایەن گۆرانی‌بێژێکی تر ، بە گۆرانی . ( گۆرانی‌بێژی یەکەم بەندێك دەڵێ و بێدەنگ دەبێ ئەوجار ئەوێتر دەست‌پێدەکا ... تا گۆرانییەکە تەواودەبێ) ٢ـ دۆپاتەکردنەوەی سەربەندی گۆرانییەك لەلایەن چەندکەسەوە (کارێکی کۆرس دەیکا) .

**ئەستری** ـ [ست : ئەستره] ، (نا.) ، (بک.) وەچێکی ڕەقی کورتی نوك تیژە کە هەندێ گیا و گوڵ (گوێنی ، ووشترخۆرە و ... ) دەری‌دەکەن . ★ درك ، درۆ ، ستری . هس : ئوستره .

**ئەستڕین** ـ (مصد. مت.) ، (مک.) ١ـ پاك‌کردنەوە ، خاوێن‌کردنەوە . :: هەمۆ شۆشەی پەنجەرەکانی ئەستڕیوە ، قاپ‌وقاچاغەکان بستڕە (بئەستڕە) ٢ـ ئیشك‌کردنەوەی دەست‌ودەم و چاو پاش شوشتن :: ها ئەوە خاولێ دەم‌وچاوت بستڕە ، بارام پاش نان‌خواردن دەستی ناشوا هەر دەیئەستڕێ . ٣ـ جیاکردنەوە و لێکردنەوەی هەر شتێکی بە لەشەوە ، بە ... نوسابێ :: چڵمت بستڕە ، ئەرێ ئەوە بۆ لۆتی منالەکە ناستڕێ . ★ سڕین .

**ئەستڕینەوە** ـ [ئەستڕین + ئەوە] ، (مصت. مت.) ١ـ خاوێن کردنەوەی جێگایەك یا شتێ کە شتێکی پێدازڕابێ ، بەبێ‌شوشتن . هەمۆ یەخەت ماستە یالڵابێستڕەوە ٢ـ کوژاندنەوە (خەت ، نوسراو) ە لەناوبردن (بیرەوەرێ ، ناو ، ...و ...) یەکێکتان ئەوەی لە تەختەڕەشەکە نوسراوە بستڕنەوە ، ناوی لە ناو ناوان ئەستڕاوەتەوە ★ سڕینەوە ، پاك‌کردنەوە ، خاوێن‌کردنەوە .

**ئەستوند** ـ (نا.) تە : ئەستون.

**ئەستوندەك** ـ [ ئەستوند + ١ـ ئەك/١ ] ، (نت.) تە : ئەستون

□ « لە داوێنی چیا بۆ خەرمەنی
گوڵ خێوەتی خارا »
« بە دۆ ئەستوندەکی زێوین
تەنافی زولفی هەڵداوە »
( حاجی : گە ـ ٩١ )

**ئەستۆ** ـ (نا.) ئەندامێکی لەشی ئادەمیزاد و گیاندارانی چوارپێ و باڵندانە ، سەلك و لەشیان تێك‌دەکاتەوە★ گەردن ، مل ، (بک.) ستۆ ، ستۆکور . **خستنە ئەستۆ (سەرئەستۆ)** ـ (کن.) ١ ـ هەڵاوەسێنی دەستێ کە شکابێ و هەڵبەستڕابێتەوە ، بەملدا

□ « دەستم کە لە صەد جێگە بە
صەد وەعدە شکاوە »
« جەبری نیە ئەم کەسرە هەتا
نەیخەیە ئەستۆ »
(حەرێق)

٢ـ سەپاندنی کار ، تاوان ، ... بەسەر کەسێکدا :: گوناهی دزییەکەیان خستە ئەستۆی ، پاش قڕە و هەرایەکی زۆر دەدێناریان

خستە ئەستۆی ، هێندەیان کار خستۆتە ئەستۆی لە ژێری دەرناچێ . **دەست دە ئەستۆکردن ــ** (کن.) ١ــ ئاشتکردنەوەی یەکێك ٢ــ ئاشتبونەوە دەگەڵ کەسێك :: دەستێ دە ئەستۆی کە با هێچی دە دڵیدا نەمێنێ ٣ــ نیشانەی خۆشەویستییە :: دەستیان دە ئەستۆی یەککردبۆ دانیشتبون . **گرتنە ئەستۆ ــ** (کن.) قبوڵکردنی کار و فرمانێك بۆ جێبەجێکردنێ ، (عا : تعهد) :: نوسینەوەی کتێبەکەی گرتۆتە ئەستۆ ، ئێوە ئەم کارە بگرنە ئەستۆ ، پەنجا دینار قەرزداری فەرهاد بۆ گرتمە ئەستۆی خۆم ★ وەئەستۆگرتن . **١ــ لە ئەستۆدان ــ** (کن.) ، ئیعدامکردن ، سەربڕین :: بێبەن لە ئەستۆی دەن . تێب ــ جاران سەرپەڕاندان بە شیر ، شێوەیێك بوە بۆ ئیعدامی کەسێك ، جا چونکو میرغەزەب شمشێرەکەی بە دودەست دەگرت و بە هەمو هێزی خۆی دایدەهێنایەوە و لە ملی کابرای دەدا، ووتراوە : (لە ئەستۆی دەن) . **٢ــ لە ئەستۆ دان ــ** ( کن.) بەڕاست زانینی قسە یاکردەوەی کەسێك ، تەئییدکردن ، شایەتی بۆ دان :: لە ئەستۆی دا و کوتی باپیر ڕاستدەکا ، هێندە پیاوی چاکە هەرچێکی بێکا و بێڵێ خەڵك بۆی لە ئەستۆ دەدەن . تێب ــ سەر بۆ لای شانی ڕاست لاردەکرێتەوە و بە لەپی دەستی ڕاست دەکێشری بە لا ملی چەپەدا ، لەوانەیە سەرچاوەی ئەم کارەش هەر بچێتەوە سەر (١ــ لەئەستۆدان) وەك بیەوی بڵێ ئەگەر قسەکەی ڕاست دەرنەچو ئامادەیە لە ئەستۆی بدرێ . **وەئەستۆگرتن ــ** (کن.) تە : گرتنە ئەستۆ :: نوسینەوەی کتێبەکەی وەئەستۆگرتوە ، ئێوە وە ئەستۆتان گرت ، من کاری وا وە ئەستۆ ناگرم.

**ئەستۆخوار ــ** (صت.) ، ( مک.) ١ــ حاڵی کەسێکی لەبەر هۆیەکی فیزیکی ملی ڕاست هەڵنەچوبێ ★ ملخوار ٢ــ (مج.) عاجز و پەرێشان ، مات و مەلول □ « نۆکەر و تابیعەی کوڕی من پاکی ئەستۆخوارە » (تحفە : ج٢ ــ ٢٢١) ★ ملخوار ٢ ــ (کن.) عاجز و کەچ /١ .

**ئەستۆشکان ــ** (مصت. لا.) ، (کن.) مردن ، لەناوچون :: دەك بە ئەستۆی شکاوبێتەوە (نەیێتەوە) .

**ئەستۆشکاندن ــ** (مصت. مت.)، (کن.) زیانگەیاندن بە خۆ، یا خەڵك، وەسەر تەڵە پەڕاندن :: ئەوە حەمەیە و دۆغرێ ، ساڵی بە هەزاری چوبێ ئەستۆی خۆی دەشکێنێ ، وادەکەی تا ئەستۆمان بشکێنێ ، هەستن بابڕوین تا لە خشتەی نەبردوین و ئەستۆی نەشکاندوین .

**ئەستۆ کەچ ــ** (صت.) ، (مک.) تە : ئەستۆخوار/٢□ «ئەستۆ کەچە ڕاوەستاوە ، حەزرەتی عیسا بۆی پاڕاوە » (تحفە : ج٢ ــ ٢٤٢ ).

**ئەستور ــ** [پە : ستەور ، ستەپر ] ، (ص.) ١ــ هەر جیسمێکی

(بعد)ی سێیەمی هەبێ // تەنـك ، بارێك :: ئەم چنارە هێندە ئەستورە باوەشـی تێوەرنـایە . ئـەم دزوە ئەستورە بە کونی دەرزیەکەوە ناچێ، کتێبێکـی ئەسـتوری پـێ بـو ، تەختەکەی هێنابوی زۆر، ئەسـتور بـو . ٢ـ (مجـ.) زۆر ، گـەورە :: حەمە قددۆی مۆسڵێ دەوڵەمەندێکی ئەستور بو ، لە پێنجوێن بەفرێکی ئەسـتور بـارێوە ، ئـەو سـاڵە سێلاوێکی ئەسـتور لە مەهـابادێ هات □ « ... رۆی‌کردە کوڵانـی سـێهەم ، لەوێ تەماشـای کـرد دوکەڵێکی ئەستور بە هەوادا دەچێ» (قزلجی : پێکەنین ــ ١٨) . تێبـ ــ ژابا ئاوێـستایێ ئەم ووشـەیەی بـە (ستەبرە) نوسیوە (تم : ژابا ــ ٩) و مۆبەد ئازەر گوشـەسب لە ( بخشی از فرهنگ اوستا و تطبیق آن بـا فارسی و کردی )دا (ل ــ ٦٦) بـە (ستەئورە)ی دەزانێ .

**ئەستوران ــ** [ ئەستور + ٢ ــ ئان/٧ ] ، (نت.) ١ـ رێسی ئەستور (لۆکە ، خـورێ ، و ...) کە بـۆ شتی هەڕەمە (گورێس، توربێن...) بڕیـرێ و گوێ نەدرێتە سـافێ و بێ‌گرێ و گوڵێ :: کچم تۆ جـارێ نازانێ هـەر ئەسـتوران بڕێسـە تافێردەبێ . // بارێکان. ٢ـ (مجـ.) قسە و کاری نارێك و نـاپوخت و بێڕێ و جێ . :: ئەم کابرایە ملـێ لێناوە ئەستوران دەڕێسی خۆشـی نازانێ دەڵێ چێ .

**ئەستورایێ ــ** [ ئەستور + ئایێ /١ ] ، (نـتـ.) ١ـ دوری دو رۆی گەورە و پانی هەمو جیسمێك لـە یەکتر (بچوکترین ــ بعد ــ لە نیوان دورۆی جیسـمێکی پتـەو ) . ٢ـ محیطی هەمو جیسمێکی ئەستوانەیێ (دار ، کوڵەکە ، لولە ...) ٣ـ ئەو شوێنـەی کە شوێنەکـانی تـری جیسمێك لە چاویا باریکتر یا تەنکتر بـن :: ئەسـتورایێ ئـەم کتێبـە ١٢ سـانتیمەترە ، بە ئەستورایـی باوەشێك ، کونی ئەسپەرە دەبێ لە قـەدەر ئەســتورایێ دەســکی پێمەڕەبێ .

**ئەستوربون ــ** (مصد. لا.) ١ ــ ئاوسـان و هەڵمسـانی لـەش یـا ئەندامێکی لەشی ئادەمێزاد و هەندێ گیاندارانی تر ، لە ئەنجامی نەخۆشێ دەرونـی و کـوان و ئـەو جـورە شتانەدا:: جێرانەکەمان زۆر نەخۆش بو ئیمرۆ ئەستورێـش بوە ، ئـەو ساڵە نەخۆشێ ماڵاتدا کەوتبو هەر مەڕێ ئەستور دەبو و بە لادا دەهات. تێبـ ــ لە کوردەواریدا وا بلاوە کـە ئەگەر لەبەرچاوی یەکێکی چڵێس و نەوسن شتێ بخۆن و بەشێ نەدەن ئەستور دەبێ. ٢ـ (کن.) قەڵەوبونی ئادەمێزاد :: تەماشـای ! دەتگـوت شەمی شایێ بایێبە ، چۆن ئەستور بـوە .

**ئەستورك ــ** [ئەستور + ئك ] ، (نت.) جورە نانێکی ئەستورە

□ « بەگیان و دڵ لە ڕەببی خۆت
دەخوازی »
« زگت پڕبـێ لە ئەسـتورك و
پیـازی »
( مەلا : گە ــ ٣٠ )

**ئەستۆرکە** ــ [ئەستۆرك + ە ــ ئە/١ ] ، (نت.) تە : ئەستۆرك .

**ئەستۆری** ــ [ ئەستۆر + ٢ ــ ئی ] ، (نت.) ١ــ ئەستۆرایی مطلق . تێب ــ جیاوازی ئەم ووشەیە دەگەل (ئەستۆرایی) لەوەدایە کە ئەمەیان ( مطلق )ە و ئەویان (معین و محدود)، ٢ ــ نەخۆشـییەکـە ( وەکـو لەکوردەوارێدا مەشـهوربو ، بەلام لەراسـتیدا نەتیجـەی هـەندێ نەخۆشی دەرۆنییە دیاریدەدا ) تە : ئەستۆر بون .

**ئەستۆکوردە** ــ (نـت.) ، (مک.) ملەقۆچە . هـس : أ ) سـتۆکور ، سـتۆکورد (بک. = ئەسـتۆ ) ب ) گوردە (فر = پشتەمل) .

**ئەستۆن** ــ [ ست. : ستەئۆنە . پە : ستۆن ] ، (نـا.) ١ــ دارێکـی ڕاسـت و ئەسـتورە وەبـەر مێچی خـانو دەدرێ ★ سـتۆن ، کۆلەکە ، هەستۆن ، هەسۆن . ٢ــ دارێکی ڕاست (یا حەیزەران)ە وەبەر خێـوەت و ڕەشمـاڵ دەدرێ ★ ئەستوندەك ، چەلاگ/٢ ، تیرەك ، دتیرەك .

**ئەستۆنەزێرینە** ــ [ ئەستۆن + ٣ــ ئـە/٢ + زێـڕ + ئێـن + ە ــ ئە/١ ] ، (نت.) کەوانەیێکی ڕەنگاورەنگە (سۆر ، نارنجی ، زەرد، سەوز، عابی، خمی، بنەوش) و کاتی تیشکی ڕۆژ لە دلۆپەی باران دەدا و دەشکێتەوە ، لە ئاسمان پەیدا دەبێ (تە : گە . فەرهەنگی مەهاباد ــ ٤٠) ★ (کی.) پرچی ئایشـە و فاتمان ، پەلکەزێڕینە ، کۆلکەزێرینە ، (بک.) کەسکەسۆر . هەسارەزێرینە، (جنو.) زەڕینەوسێمینە ، دوێتۆکوڕ .

**ئەسـتەخفیرۆلّلا** ــ [ـ عـا : استغفرالله ] ڕستەیەکە ، گوتنی لە کوردەوارێدا بـاوە مـانای (داوای بەخشێن دەکەم لەخـودا )یە . ١ــ ئەگەر کەسێ قسـەیێکی ( بەتایبەتی کفر ) لەدەم بێتەدەر یا گوێی لێبـی یەکێك قسـەی لەم بابەتە دەکـا ، بۆ دەربڕێنـی پەشـێمـانی و دۆرخستنەوەی گوناحی کفرەکەی خۆی ، یا نارەزایی لەوەی بێستۆیە دەیلێ:: خوایە تۆبە و ئەستەخفیرۆللا ٢ ــ بۆ حاشـاکردن لەکـارێك دەگوترێ .

□ « من بەگوناهکار ئەدەنە قەلەم »
« ئەستەخفـیرۆللا پادشـای ئەفخەم »
( سەلام ــ ١٦٤ )

**ئەستەم** ــ [ پە : سـتەهم ] ، (نا.) دژوار ، زەحمەت ، نارەحەت. :: زور ئەستەمە ( گەلێ دژوارە )

□ « ئەم چەرخە کۆنە ماشێنەکەی ژەنگی گرتـوە »
« چەورێ نەکـا بەخوێنـەکی سۆرانی ئەسـتەمە »
( شێخ ئەحمەدی سریلاوایی )

هس : ئاستەم ، ستەم .

**ئەستەوێر** ــ (صـ.) ، ( هل.) تە: ئەستێوور .

**ئەستێ** ــ (نا.) ، (مک.) پارچـە پۆلایێکـە پڕێشـکی ئـاگر لـە (بەردئەستێ) دەکاتەوە . تێب ــ ئەم پارچە پۆلایە وەکو ئالقەیێکی شێوە سێسـۆچ وایـە ، کەمێـك

(پۆشوی‌دار)یان لەسەر (بەردەستێ) دادنا و بەوپۆلایە یەك دوٚ جار لە بەردەکەیان دەدا ، پرێشکی ئاگر ، ئاگری دەپۆشوٚ بەردەدا و دەیان خستە سەر سەبێلە و قەلنە ، ئەو وەختەش کە هێشتا تفەنگی تازە و (چەشنێ) لە کوردستان دانەکەوتبوٚ، پۆشوٚیان ئاگر تێ بەردەدا و دەیان‌خستە سەر تێسکەی تفەنگە کوٚنەکان ـ کە باروٚت و گوللەیان تێ‌کردبوٚ ئاخنێ‌بوٚیانەوە ـ و پێ‌یان ئاگردەدا ★ (بک.) هەستە ( تە : کف ـ ٣١٤ ، ژابا ـ ٤٤٤ ) .

**ئەستێر** ـ (نا.) ، ( مک.) تە : ئەستێل .

**ئەستێرك** ـ [ ئەستێر + ئك ]، (نت.) تە : ئەستێل .

**ئەستێرە** ـ [ ست : ستەر ، پە : ستەر ، سپتار ، ستارەك ] ، (نا.) ١ـ هەموٚ ئەو جیسمانەی کە شەوانە وەکوٚ خالێکی بچوٚکی روٚناك لەئاسمان دەدرەوشێنەوە، بەگشتی دوٚجوٚرن: گەروٚك ، نەگەر. ٢ـ تە : ئەستێرەی بەخت :: ئەستێرەی‌گەشە ، ئەستێرەی بلێندە ، ئەستێرەیان لەکزیبە ★ (سن.) ستارە ، (هو.) هەسارە (بک.) ستێر ، ستێرك . ئەختەر . **ئەستێرەی بەخت** ـ (نت.) ئەستێرەیەکی چارەنوٚسی ئینسانێکی پێوە بەندبێ ★ ئەستێرە/٢ ، ئەستێرەی تالع . تێب ـ بەشێکی زانستی ئەستێرەناسێ کوٚن وای دادەنا کە چارەنوٚسی دنیا و هەموٚ خەلکی دنیا پەیوەندێ هەیە دەگەل حەوت ئەستێرەی گەروٚك (تە : ـ ) کە تا ئەو کاتە ناسرابوٚن ، بەپێی حیساباتێکی دوٚرو درێژ دەیان‌دوٚزیەوە کە فلان ئینسان لەژێر سێبەری کام ئەستێرەدایە و کەی لەدایك بوە ، ئەو ئەستێرەیە لە کامە ( بورج )دابوە ، ئەوسا چارەنوٚسی کابرا لەروٚی گەرانی ئەو ئەستێرەیە دیاری‌دەکرا ، پاتشایانی کوٚن بوٚ ئەم مەبەستە و گەلێ مەبەستێ‌تر ، ئەستێرەناسی تایبەتییان لە بارەگاکانیان رادەگرت . **ئەستێرەی بەیان** ـ (نت .) تە : ئەستێرەی روٚژێ. **ئەستێرەی تالع** ـ (نت .) تە: ئەستێرەی بەخت

□ « ئەستێرەی تالع روٚی‌کردە نەهات »
« بێ شنە و سروەی شەمال کزومات »
( پیرەمێرد ـ ٣٢٠ )

**ئەستێرەی روٚژێ** ـ ( نت . ) ئەستێرەیەکە دەگەل سپێدە سەر لە لە ئاسوٚ دەردێنێ □ « چاووت ئەستێرەی روٚژێ ، سوٚفیان پێی دەچنە نوێژێ » ( فولکلوٚر ) ★ ئەستێرەی بەیان . **ئەستێرەی سەرشان** ـ (نت .) ، (تن .) شتێکە لە مەعدەنێکی زەردیاسپێ ، لە شێوەی ئەستێرە دروست‌دەکرێ ، ئەفسەرانی لەشکری هەر دەولەتێك بەپێی گەورە و پچوٚکییان و بەو جوٚرەی قانوٚنی وولاتەکەیان داینراوە چەند دانەیێکی لەسەر شان یا جێگای‌تریان دادەدروٚن . :: ئەم ئەفسەرە سێ ئەستێرەی لەسەر شانە ، بێ‌قەزابی خوٚ ئەستێرەمان

بۆمان دەردەخا کە ڕای دوەم لە ڕاستی نیزیکترە . ★ ئەمەتانی ، ئەمەتە ، ئەمەسە، ئەوەتا، ئەوەتانی . ( بک. ) ئەڤە ، ڤایە .

**ئەمەتانی** ــ [ئەمەتا + ا ــ ئانی]، ( شر . ) تە : ئەمەتا .

**ئەمەتە** ــ [ ئەمەتا + ا ــ ئە ] ، ( شر .) تە : ئەمەتا .

**ئەمریکا** ــ ( نا.) ، (کعر.) تە : ئەمریکـا .

**ئەمەسە** ــ [ ا ــ ئەمە + سا ] ، ( شر .) ، ( سنـ.) تە : ئەمەتا .

**ئەمەگ** ــ [ أ ] ، ( نا.) ا ــ کاری سەخت و قورس کە پیاو ماندو بکا. هس : ئەرك . ٢ــ ئەو هەقەیە کە دایـك و بـاب لەبەر مـاندوبەتی پێگەیـــاندن و بەخێـــوکردن ، دەیانکەوێتە سەر منداڵی خۆیان . :: کوڕ قەت لە ئەمەگی دایك و باب دەرنـاچێ ، بۆڵە ڕەببی ئەمەگـم بتگـرێ . ٣ــ ( مـجـ .) هەقێکـی لەئەنجامی ماندوبون بە کەسێکەوە ( جێبەجێکردنـی کـــارێکی ، ڕزگــارکردنی لـــە تەنگـــانە ، لەکۆڵکردنەوەی گیروگرفت و ...) بۆ یەکێك ساز دەبێ . :: ئەوەندەی ئەمـــەگی زۆراب بەســـەرەوەیە نەبێتەوە . تێـبـ ــ ا ) لــە هەنـدێ قامۆسـاندا ئەم وشـــەیە ( ئەمــەك ) نوسراوە ، ئەوی ڕاستبێ بەســەر زمانانەوە بێجگـە لە دەنگـی ( گ ) شتێکیتر نابێسترێ . بۆ ئەوەی (ك) تەلەفوزبکرێ پیویسـتـە قورسـایی زیاد بخرێتە سەر شەویلاکە . ب) هیندیـك بە ووشـەیێکـی تورکـی دەزانـــن ( تە : ڕابـا ــ ٢٠ ) و لـــە زمانی ئازربایەجانێشدا بەکاردێت .

**ئەمەگ بەجێهێنان** ــ ( مصد. لآ. ) پاداشدانـــەوە ، خزمـــەتکردنی کەسێك بەرامبـــەر بە مـــاندوبونی بەکارێکەوە ، وەفا بەجێگەیاندن . ◻ « ... زۆری نەخایاند دایکیشی ئەمەگی بەجێهێنا و دوای بـاوکی کەوت بۆ شاری خامۆشان ... » ، ( قزلجـی : پێکەنێـن ــ ١٠١ ) .

**ئەمەگ بەسەرەوە بون** ــ ژێرباری کەسێك بۆ کەسێکی تر لەبەر ئەوەی کە پێیەوە ماندو بوە. ◻ « ڕەفێقێنە ئەمە زۆرمان ئەمەگی ئەو پیـاوەی لەســـەرە ... » ( تحفـە : ج ا ــ ١٩٨ ) .

**ئەمەگ دەگەڵ کێشـان** ــ ( مصد. متـ.) ا ــ خۆ ماندوکردنـی دایك و باب بۆ پێگەیاندنی منداڵ ◻ « چـێدێ ئەمەگـێ ناکێشـم بـە خۆڕایی دەگەڵ هەتیوی خەڵقییە » ( تحفـە : ج ٢ ــ ٨٨ ) . :: ئـــەم هەمو ئەمەگەی دەگەڵ کێشـــاوون ، کەچی ئێستا یەکێکیان لەو دایکـە فەقیرەیان ناپرسنەوە . ٢ــ خەرێك بون و خۆ ماندوکردنی کەسێك بــە جێبـــەجێکردن و ڕاپەرانـــدنی ئیشوکاری یەکێکی ترەوە .

**ئەمەگ بەخەسار** ــ [کو. عا.] ، ( صـ.) ا ــ حاڵی دایك و بـابێکی منداڵیان نالەبار و نەعاملاوبێ . :: دایەگیان بەهومێدی خودای نایەڵم ئەمـــەگ بەخەســـاربێ . ئەمـــەگ بەخەسار خۆی منداڵەکانی یەکێکیان باش دەرنەچون. ٢ــ حاڵی کەسێکی سەرەڕای ماندوبـون بەکارێکـــەوە

هیچی بۆ حیساب نەکرێ .
**ئەمەگ‌دانەوە** ـ ( مصت. لا. )
تە : ئەمەگ (ەئەمەگ بەجێ‌هێنان ) .
**ئەمەل** ـ [= عا : أمل ] ، (نا.)
تە : ئومێد . :: هێچ ئەمەلی نەماوە ڕوحمی خوا نەبێ ، ئەمەلت بەم کابرایە نەبێ .
☐ « خستییە ناو قەفەس ، بڕا ، ڕێی ئەمەل »
« هێچ چارەی نەما ، بێجگە لە ئەجەل »
( سەلام ـ ١٤٠ )
**ئەمەند** ـ [ ئەم + هەند ] ، ( بنت. ) تە : ئەمەندە .
**ئەمەندۆچکە** ـ [ ئەمەند + ئۆچکە ] ، ( بنت.) میقدارێکی کەمتر لە ئەمەندۆکەی پێ دیاریێ دەکرێ . ★ ئەمەندۆسکە ، ئەوەندۆسکە .
**ئەمەندۆسکانە** ـ [ ئەمەندۆسکە + ئانە/١ ] ، ( بنت.) تە : ئەمەندۆکانە .
**ئەمەندۆسکە** ـ [ ئەمەند + ئۆسکە = ئۆچکە ] ، ( بنت.) تە : ئەمە ندۆچکە . تێب ـ دەنگی (چ)ی ئۆچکە لەسەر زمانان بۆتە (س) .
**ئەمەندۆکانە** ـ [ ئەمەندۆکە + ئانە/١ ] ، ( بنت.) بۆ موبالەغە لە بچوك نیشاندانی شتێکدا.:: هێشتا ئەمەندۆکانەیە ، وایە ! گەورەتربێ چۆن دەبێ . ★ ئەمەندۆسکانە .
**ئەمەندۆکە** ـ [ئەمەند + ئۆکە] ، (بنت.) میقدارێکی کەمتر لە (ئەمەندە) پێشان‌دەدا .
**ئەمەندە** ـ [ ئەم + هەند (هێند) + ٢ـ ئە/٢ ] ، ( بنت.) ١ـ بە شێوەیێکی نامەحدوود میقدارێك پێشان‌دەدا ( جاروبارە بە ئیشارەی دەست یان بەراوەردکردن دەگەل شتێکی‌تر تەحدید دەکرێ) . :: مارێکمان کوشت ئەمەندە درێژ بوو نەبێتەوە ، ئەمەندەی بەرچێفێکیش ئەستوور بوو . قەت وولاغم نەدیتوە ئەمەندە بەرز و شۆخ . ئافرەتی ئەمەندە جوان هەر نابێتەوە . ٢ ـ وەلامی پرسیاری ( چەند ) و ( چەندە )ی پێ‌دەدرێتەوە . :: مارەکەی کوشتتان چەندە درێژبوو أـ ئەمەندەی پشتێندێك . ★ ئەمەند ، ئەمەنە ، ئەوەند ، ئەوەندە ، ئەوەنە ، هێندە .
**ئەمەنە** ـ (بنت.) ، ( سن.) تە : ئەمەندە. تێب ـ لە قسەکردنا (ن)ەکە تۆزێك دەگیرێ ، هەروەکو (ن)ێکی سۆکی لە پێشەوەبێ وایە .
**( ـ ئەمەنی )** ـ ( پب.) بە دوای ڕەگی هەندێ فیعلی ڕابردووە دەنووسێ و ناوی شتێکی لێ پێکدێنێ کە ( فیعل )ەکە بەبێ ئەو سەرناگرێ ( تە : هبێد ـ ٤٤ و ٤٥ ) . :: سووتەمەنی ( ئەو شتەی سووتان بێ ئەو نابێ ) ، خواردەمەنی ( ئەو شتانەی بۆ خواردن دەشێن). تێب ـ لەم سالانەی دوایێدا ووشەی ( چاپەمەنی ) لەباتی ( مطبوعات )ی عەرەبی داتاشراوە . ئەمە بە دوو سەران هەڵەیە ، یەکیان پاشبەندەکە خراوەتە سەر (ناو)ێك و ناوێکی‌تری پێ دروستکراوە ، کە دەگەل ڕەوتی زمانی کوردیێدا ڕێك نیە . دوەمیان ئەوەیە ئەگەر چاومان لەو

هەڵەیەش قۆچاند دەبوایە ووشـە
تازەکە مانای ( کەرەستەی چاپ ) یا
( نوسراوێکـی بـۆ چـاپکردن )
ئامادەکراوە ، بدات کەچی دەبینین
لەباتی چاپکراو بەکار دەهێنرێ .

**ئەمیانە** ــ [ ئـەم + یە ( یەك )
+ ئانـە/١ ] ، ( بنت. ) ، ( جـﻔ. )
ئەمەیان . وەڵامی پرسیاری (کامیان،
کیهەیان ؟ )ی پێ دەدرێتەوە :: لەم
کراسانە کامیان باشن ؟ ئەمیانە .

**ئەمێتر** ــ [ ئـەم + ١ــ ئـێ/٢
+ تر ] ، ( نت. ) تە : ئەمێکە .

**ئەمێکە** ــ [ ئەم + ١ــ ئێ/٢ +
کە ( دێکـە ) ] ، ( نت. ) ، ( سـیم. )
ناوی ئیشـارەیە بۆ دیـاریکردنی
شـتێك لەنـاو کۆمـەڵێ شـتی
هاوچەشن . :: کوڕە ئەم کتێبەیان
نـاڵێم ، ئەمێکـە . ★ ئـەمێتر ،
ئەوێدی ، ئەوێدیکە .

**ئەمیە** ــ [ ئـەم + یە ( یـەك )
+ ٢ــ ئە/٢ ] ، (نت.) تە : ١ــ ئەمە.
وەڵامی پرسیاری ( کامە ، کامیە )ی
پێدەدرێتەوە .

□ « بیستۆمە خانم لۆتی بەزێنە »
«ئەمیەی بۆ خاسە ... تەزێنە»
( فۆلکلۆر )

**ئەمێ** ــ [ ئەم + یێ ] ، (بنت.)
تە : ئێرە . تێب ــ بەلای منەوە کەرتی
دوەمی ئـەم ووشـەیە (یێ) دەگەڵ
(یاگە)ی هەورامی بـە مانای (جێ ،
جێگە) پەیوەندی هەیە .

**ئەمێستا** ــ [ ئەم + ئێست +
ئا (= ٥ ــ ئە/١ ) ] ، ( بنتـ . ) ،
(کعر.) تە : ئێسـتە .

**ئەمێستە** ــ [ ئەم + ئێست +
٥ ــ ئە/١ ] ، (بنت.) ، (کعر.) تە :
ئێسـتە .

**ئەمێیانە** ــ [ ئـەمێ + ٢ــ
ئان/١ + ٥ــ ئە/١ ] ،.(نت .) ناوی
ئیشارەیە : ئـەم جێگایانە ، ئـەم
دەوروبەرە . جەمعی (ئەمێ)یە .

**ئەمیر** ــ [=عا: امیر (ئەوکەسەی
ئەمردەکا) ] ، (نـا.) ، (کعر.) ١ــ
شازادە ، کوڕی پاتشا . ٢ــ لەقەبە
بۆ ئەو کەسانەی لە بنەماڵەی پاتشان

□ « پەردە و تارای سـور بـەرن
بۆ ئەمیر »
« بڵێن پاش کوشـتار هێشـتا
تۆی دڵگیر »
( پیرەمێرد ــ ١٠٢ )

٣ــ پلەیەکە لـەخوار پاتشـایەتی ،
فەرمـــانڕەوا و حوکمـــداری
ئەمارەتێك . :: ئەمیری بەحرەین ،
ئەمیری کوێت ، ئەمیری مۆناکۆ .
هس : میر . ٤ــ ناوە بۆ نێرینە //
ئەمیرە .

**ئەمیرە** ــ [ = عا : امـیرە ] ،
(کعر.) ١ــ لەقەبە بۆ ئافرەتێ کە لە
بنەماڵەی پاتشا بێ . ٢ــ نـاوە بۆ
کچان .

**ئەمین** ــ [ = عا : امین ] ، (صـ.)
١ــ ڕاست و دروسـت ، دەسپاك
:: شاگردێکی ئەمینە بـە ئانقەست
پۆلمان فرێداوە هـەڵێ نەگرتوە .
٢ــ حاڵی ڕێگاوبان کە ترسی دز و
جەردە و خراپـەی‌تری لێ‌نەکرێ ،
حاڵی شوێنێکی پیاو ترسی ئەوەی
نەبێ لەوێ شتێکی بەسـەربێ یـا
تۆشی بەلایەك بێ . :: ڕێگا زور
ئەمینە شەوێش هاتوچۆ هـەیە ،

جێگای وا ئـەمێن هـەر نابێتـەوە شەیتانیش شکێ ناکا . ٤ـ بارگێنی ئارام و لەسـەرخۆ . :: کوڕە وەیسە وولاغێکی ئەمێن بۆ مـیرزا زین کەن

**١ـ ئەمێن بـوون** ـ (لەکەسی ، لەشوێنـێ ، لەخـۆ ) [ عـا. کو. ] (مصت. لا. ) ١ـ نەترسان . :: ئەوە هێندە لەو شوێنە ئەمێنن وا پاڵتان لێ داوەتەوە ؟ ٢ـ دڵنیابوون ، خاتر جەم بوون . :: لـەم زەمانەدا نابێ پیاو لەکەس ئەمێن بێ ، ئەمێن بـە ئەو کوڕە من بێناسـم دروٚت لەگەل ناکا . ٣ـ (مج .) دەخـۆڕادێتن ، بەخۆ ڕاپەرموون ، بڕوا بەتوانای خـۆ هەبوون بۆ جێبەجێ کردنی کارێك .

**٢ـ ئەمێن بوون** ـ [ عا. کو.] ، (مصت. لا.) دەس پاك بوون، دز نەبوون. :: کوڕم پیاو کە ئەمێن بـوو دەبێتە شـەرێکی خەڵك .

**ئەمێندار** ـ [ ئەمێن + دار ] ، [عا. کو.] ، (نفا. ، صفا.) کەسێکی شتێکی بە ئەمانەت لەلا دابنێن ، بۆ ڕاگرتن و پاراسـتن و چـاوەدێری کردنێ . :: مام عەولای سەوزێچی ئەمێنداری باغی مکایلێ بوو .

**ئەمینداری** ـ [ ئەمیندار + ٢ـ ئێ ] ، ( حمص . ) پیشـەی کەسێك کە خەڵك شتێ بە ئەمانەت لا دانێن . :: بـە ئەمێنداریێ لـە ماڵـەکەیان دانیشتوە، بە ئەمێنداریێ ناردوویانەتە سەر خەرمانەکان .

**ئەمین کردنەوە** ـ [ عا. کو. ] ، (مصت. مت.) ١ـ ترس ڕەواندنەوەی کەسـێکی ( لەبـەر هـەرچێ بێ ) ترسابێ و خـۆی شاردبێتەوە یـا هەڵاتبێ. :: دزەکانیان ئەمێن کردەوە پاشان گرتیانن ، دە بچن ئەو کوڕە ئەمێن کەنەوە با بێتەوە . ٢ـ (مج.) گرتنـەوەی بـارگین و ئێسـتری بەرهەڵبوو .

**ئەنام** ـ (نـا.) ، (سـنـ .) تم : ئەندام .

**ئەنتیکە** ـ [= فڕەنسێ : ئانتیك . لاتینی : ئانتیکوس= کۆن، قەدیمی]، (نا. و صـ.) ١ـ هەرشتێکی کونێنەی زەمانەکانی پێشـوو کـە لەژێرخاکا بدوزرێتـەوە :: دربـاز دێیـەکە لەنێزیك مەهابات شـتی ئەنتیکەی زۆر لێ دەدۆزنەوە ، هەندێ قەبری کۆن لەکوردستان شـتی ئەنتیکەیان تێدایە . □ « ... ئەم ماوەیە شتی ئەنتیکەم زوردێ ... » ( قەفتان : چێڕۆك ـ ٣ ) ٢ـ (مج.) ، أ) هەموو شتێکی نایاب . ب) سەیروسەمەرە. :: ئـەم پیـاوە زۆر ئـەنتیکەو قسەخۆشـە . ج) بەتوڕێیەوە ـ نالەبار ، نـاقولا ، کـەم فام ... :: کوڕە خـۆ ئـەم پیـاوە هـەر زۆر ئەنتیکەیـە . ★ عەنتیکە . تێبـ ـ ئەوی ڕاست بێ ئـەم ووشـەیە کەم دەکـاردەکرێ و خـەڵـکی لادێ و نەخوێندەوار هەر (عەنتیکە) دەڵێن .

**ئەنجام** ـ [ پە : هەنجام ] ، (نا.) دوایێ ، نەتیجـە ، عاقیبـەت . :: ئەم کارە ئـەنجامێکی چاکی نـابێ ، دیاربوو ئێشـەکەیان ئەمە ئەنجامێتی .

**بەئەنجام گەیاندن** ـ بردنەسـەر ، تەواوکردن ، گەیاندنەنەتیجە . :: هێچ ئێشێك بەئەنجام ناگەیێنێ ★ گەیاندنـە ئـەنجام . **بەئـەنجام**

**گەییشتن** ــ تە : گەیشتنە ئەنجام .
**گەیاندنە ئەنجام** ــ تمـ : بەئـەنجام گەیاندن . :: لەوباوەڕەدا مەبە کـە ئەم‌ئیشە بگەیەننە ئەنجام. **گەییشتنە ئەنجام** ــ ١ـ ( کەسێك ) نەتیجـە وەرگرتن لەکار و کردەوەو قسـەو.. :: بـەم جـۆرە باسـێ ڕۆژی‌تریش نەدەگەیشتە ئـەنجام . ٢ـ ( کار ) فایدە بەخشین، نەتیجە لێ پەیدابون :: کاری‌وا بێ سەرەو بـەرە چۆن گەیشتە ئەنجام ! .

**ئەنجامە** ــ (نت.) ، (کعر. سنـ.) پارچە ئاسنێکی دۆلەتە کە بەسەریەکا دەنوشتێتـەوە ، دەرگاو پەنجـەرە بەچوارچێوەوە دەبەستێتەوە ،گەلێ جۆرێ هەیە ★ (مکـ.) لاولاوە. تێبـ ــ ئەم ووشەیە لـە زمانی فارسـیدا ئەوێش هەر لەقامۆساندا ( ئاهـەن جامە )یـە کـە شـکلێکی کۆنتری ووشـەکەیە و لـەزمانی کوردیـدا پلەیێك زیاتر لێك و لۆس بوە و دەنگە سستەکانی سەنگ و سۆك کراون . بەکەندەردۆ وا دێتـە بەرچاو کـە ( ئاهەن‌جامە ) لە دۆ کەرتی : (ئاهەن = ئاسـن) و (جـامە = کـراس ) پێکهـاتبێ سـەرەڕای ئـەوەی کـە (کراسی ئاسـن ) هێـچ پێوەندێکی دەگەڵ ئەو شتەنیە کە نـاوی نراوە (ئەنجـامە یا ئاهەن‌جامە) ، ئـەگەر لەڕاسـتیدا کـەرتێ یەکـەم وەك بەڕواڵەت دەردەکەوێ (ئاهەن) بوایە دەبوایـە ووشـەکە بیسـێ و دۆ لەکوردیدا ببێتە ( ئاسنجامە ) . من واتێدەگەم پارچەکانی ئـەم ووشەیە ئاوابن : [ ئەن ( ئا + هەن ) + جام + ٢ـ ئە/٢ ] کە هەریەکەیان بەجیا باس دەکەین. أ) ــ ئا ــ پێشبەندێکی ئاوێستاییە « مانای : بە، لەکن ، دەگەڵ ، لەسـەر و سـەرەوەیە و هەندێ‌جار لەپێش ووشەیێکدا دێ بەڵام کارناکاتە سەرمانای ... بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم پیشبەندە بۆ بە هێزکردنی مانای هەندێ ووشەیە » تم : ( ئەوزەنگ : بەهرام ــ١٧٥ ). ب) ــهەنــ : « ... پێشـبەندەو مانای : پێکەوە ، دەگەڵ ، هـاو ، دەدا » ( سـەرچاوەکەی پێشـۆ ــ ٢٤٧ ) . ج) ــجامــ ئەم ووشەیە لە ( گـەم ، گـام )ی ئاوێسـتایی‌ڕا جەڕاندراوە کە « ... گەم (= جەس) بەمـەعنای هـەنگاو هـەڵێنان ، ــ گەیشتن ... و نیزیك‌بونەوەیە » تم : (پد : یگد، جر٢ــ٥). لەموکریان (گاو) بە پارچـە ئاسـنێکی پچکۆلە ( بەقـەدەر بزمـارێ ) دەڵێن کـە لەت‌وکوتی (چینێ) شکاوی پێ‌پێکەوە دەلکێنن .

بەم‌جۆرە ووشـەکە بـەتێکڕایێ مانای : پێك‌گەیشتن ، پێك‌گەیاندن دەدا و پڕ بە پێستی ئـەو ئامرازەیە کە دەرگاو چوارچێوە پێك‌دەگەیێنێ و ئەم ووشەیەی بۆ کراوە بە ناو .

**ئـەنجندراو** ــ (صمف. نمف. : ئەنجنین ) پارچەپارچە کراو ، لەت‌و پەت‌کراو، وورد ووردکراو، لەشێکی زۆر خەنجەر لێدراو ★ ئەنجنراو ، جندراو ، جنراو .

**ئەنجنراو** ــ ( صمف. نمف. ) تم : ئەنجندراو .

**ئەنجنین** ــ [ ئەن + جنین ] ،

( مصت . مت . ) ، ( مک . ) ١ــ وورد وورد کردنی گۆشتو پیوازو ئــەم جۆرەشــتانە . :: فاتــە خێراکــە پیوازەکە بنجنە ( بئەنجنــە ) . ٢ــ بڕینی زور لە کەسێك کردن ( بــە خەنجەر ، چەقۆ . . . و . . . ) . :: بە خەنجەران ئەنجنیبۆیان ★ جنێن، هەنجنێن . تێب ــ ئــەم ووشەیە هەروەك لەسەرەوە پێشاندراوە لــە دۆ پارچەی ( ئەن = هەن ) و (جنین) پێکهاتوە کە هەردۆکیان دەگەڕێنەوە سەر ئاوێستایێ و یەکەمیان لەباسی ووشەی (ئەنجامە)دا شیکراوەتەوە، دەمێنێتەوە دوەمیان ( جنین )ە کــە لە زمانی کوردێ ئێســتادا شــکلی مەصدەری بەخۆیەوە گرتوە ، لــە فیعلیکی کۆنی ئاوێستایێ ( جــەن ) وەرگیراوە : « جەن بەمانای لێدان ، کوشتن و لەناو بردن ، لەئاوێستادا زۆر هــاتوە ، ووشەکانی کــە لێی کەوتۆنەوە زۆرن » تە : ( پد : یگد ، ج٢ ــ ١٦٦) بەمجۆرە مانای تەرکیبێ ووشەکە دەبێتە ( پێکەوە لێدان ) کە ئێستاش هەر ئەو مــانایەی هــەیە (زۆرجار چەقۆ لەشتێك دەدرێ و لێدانی ناپسێتەوە ــ پێکەوە ــ یە ).

**ئەنجن ئەنجن کردن ــ** (مصت. مت.) ١ــ وورد ووردکردن ، لەتوپــەت کردن ، پارچەپارچەکردن . ٢ــ تە : ئەنجنێن/٢ . ::هەمۆ گیانیان ئەنجن ئەنجن کرد .

**ئەنجومەن ــ** [ ستە : هەنجەمەن، پە : هەنجەمەن]،(نا.) ١ــدەزگایەکی هەمیشــەییە کــە لــەچەنــدکەس پێکهاتبێ،بۆ هەلسوڕاندنی کاروبار و ناوبەناو کۆبێتەوە بۆ تەگبیرکردن . :: ئەنجومەنی وەزیران ، ئەنجومەنی ئاشــتیێ ، ئەفراســیاو ئــەندامی ئەنجومەنی شــارە . ٢ــ جێگایێکی بۆ کۆبونەوەی ئەو چەشنە دەزگایانە تەرخان کرابێ . :: ئەنجومەنی شار لە خانوی میرزا ڕەحمەتێ دایــە . تێب ــ بەلای منەوە ئەم ووشەیە لــە سێ کەرت [ هەنگ + ئو + مان ] پێکهــاتوە و کونتــرین شــێوەی ئاوێستایێکەی (هەئێن (گ) ێو دێمانە) یا (تهەنگێو دێمانە) بوە کە هەردۆکیان بە کەلکی ئــەم لێکۆلینەوەیە دێن : أ) هەنگ لە ( هەئێنا )ی ئاوێستایی وەرگیرابێ کە بەمانای ( دەستە ، کۆمەڵو جەماعەت)ە تە : (ئەوڕەنگ: بەهرام ــ ٢٤٤ ) و پەهلەوێش هەر بەومانایانە لەئاوێستایێ وەرگرتوە ، ئێستاش لە بن لەهجەی موکریانێ و هەندێ بن‌لەهجەی باکوریدا لەقالبی (ئەنگۆ) ، هەنگۆ ، هنگ ، هۆن = ئێوە ) دادەبێندرێ و زمانی فارسی زیندۆی کردۆتەوە و لەباتی (فەوج) بــەکاری دێنێ . ب) هــەنگ لــە (تهــەنگ)ی ئاوێســتایی بەمانــای (تێگەیشتن ، زانایی ) داتاشــرابێ تە ( فرە : پفــا ــ ٢٠٦ و معــین : فەرهەنگ ، ج٤ ــ ٥٢١٠ ) کە ئێستا لەووشەی ( فەرهەنگ)دا دەبینێن . ج) ئو : ئامرازی ئیزافەیە ، ئێستاش (ئو) لە لەهجەی هــەورامیدا هــەر ئامرازی ئیــزافەیە . د) مان : لە (دێمانە)ی ئاوێستایێ داتاشراوە و مانای ( ماڵ ، خانۆ ) دەدا تە : (پد : یگد ، ج٢ ــ ١٢٦ ) لە ( خان‌ومان) و

(نیشتمان)دا هەر بەو مانایە ماوە . جا ئێستا ئەگەر هەمۆ ئەوانە تێـك بکەینەوە بۆ ووشەی (ئەنجومەن) دۆ مەعنامان دێتە دەست : ١) خانۆی جەماعەت، ماڵی کۆمەڵ . ٢) خانۆی زاناو تێگەیشتوان ، خانۆی زانین و تێگەیشتن .

**ئەنجەت** ــ [محر. عا : حجّة] ، (نا.) ، (مکـ.) تە : ئینجەت .

**ئەنجەل** ــ [محر. عا.] ، (نا.) ، تە : ئەجەل .

**١ــ ئەنداز** ــ [ = ئـەندازە ] ، (نا.) تە : ئـەندازە/١ :: لـەئەنداز بەدەرە .

**٢ــ (ــ ئەنداز)** ــ ( ر.. فە. ) کـاری پاشـــبەند دەکـا و بـە دوای ناوێکەوە دەلـکێ و ناوێـکی تازە دروسـت دەکا . :: بـارەنداز (بار ئەنداز ) ، پایەنداز (پائەنداز) ، تیرەنداز ( تیرئەنـداز ) چاوەنـداز (چاوئەنداز)، خاکەنداز (خاك‌ئەنداز) . تیب ــ ئـەم ووشـەیە ڕیشـەی مەصدەرێکە کە لەفارسـیدا بـۆتە (ئەنداختەن) و لە سەرفکردنا بـۆ زەمانی ئایندەو . . . دەبێتە (ئەنداز) بەرامبەری ئەم مەصدەرە لەکوردیدا (ئاویشتن) هەیە .

**ئەندازە** ــ [ پە : هەنداچەك ] ، (نـا.) ١ــ حـەجم یا میقـــداری هەرشتێك بە کێشانە یان پێوانە . :: بەئەندازەی شـەش‌گەز فاسونیایان بۆبکڕە، بەئەندازەی سێ کیلۆ دەبێ، ئەندازەی قاچێ چەندە؟ ٢ــ نەگەورە نەپچۆك ، پڕبەپێست، لەقەدەرحاڵ، حەددی مەعمـۆلێ هەرشـتێك .

□ « بۆرە نەبێ بازەبێ ، کلکی لە ئەندازە بێ » . ٣ــ مقیاسە هەندێ لە سەنعاتکار (بەنا ، جلدرۆ . . .) بۆ هەندێ کاروباری پێشەی خۆیان تەرخانی دەکەن و بەپێی مەبەست شـــکلی دەگـۆڕێ و گـەورە و پچـۆکیش دەبێ . :: ئەنـدازەی بەنایان ، ئەندازەی بەرە تاسکڵاو ، ئەنـدازەی وولاغـان ( بۆ پێـوانی بەرزی و نزمێ ) .

□ « قەت بەیەك ناگەن لەیەك‌جا
ئەم خەزانو ئەو بەهار »
« ڕاستێ شمشاد و قەددی
تۆ بەئەندازەی یەکن »
(سالم : گە ــ ٦٠)

**زیـــاد لـە ئەنـــدازە** ــ تمـ : لەئەندازە بەدەر . :: ئەم پاڵتۆیە زیـاد لەئەندازە گـەورە و دەڵبە دەڵەی بۆتۆ نەکراوە . **لە ئەنـــدازە بەدەر** ــ حـاڵی شـتێك کـە لـە حـەددی مەعمـۆلێ تێپـەڕێبێ . □ « . . . دانـــەکانی ڕەش هەڵـگەڕاون ، هەمـــۆ ، هـۆی جگەرەکێشانی لەئەندازە بەدەرە . . » (قەفتان : چێڕۆك ــ ٧٠) ★ زیاد لە ئەندازە ، بێ‌ئەندازە .

**ئەندازەگرتن** ــ (مصت. متـ.) ١ــ پێـوانی درێـژی ، پانـایی ، قوڵایێ ، بـەرزایێ یا ئەسـتۆرایێ شتێك . ٢ــ دیاری کردنی میقیاسی جل‌وبەرگی ئینسان . :: بچۆ لای خەیاتەکە بـا ئەندازەت بگـرێ . □ « . . . هادێ‌خـان بـۆ ئەندازەگرتنی هێلـکەکان ، کونێکی خۆی کردۆتە تەختەیەك . . . »

(قزڵجی : پێکەنین ــ ١١٨) .

**ئەندام ــ** [ ستە : هەنــدامە . پە : هەنام ، هەندام ، هەننام ] ، (نا.) تە : ٢ــ ئــازا . ٢ــ (تتــ.) کەسێکی لــە پارتێکی سـیاسی ، ڕێکخراوێکی پیشەیی یا لیژنەیێکی تایبەتی و ... و ... کــاردەکا . :: ئەنــدامی پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان ، ئەنــدامی یەکێتــی نوســەرانی کــورد . ٣ــ (تتــ.) دەوڵەت یا وولاتێك کە لە یەکگرتنی چەنــد دەوڵەتدا بــۆ مەبەستێکی تایبەتی یا بۆ یەکێتــی و پێکهێنانی دەوڵەتێکی فیدڕاڵی ، بەشداردەبێ . :: دەوڵەتی ئازربایەجان ئەندامە لە یەکێتی شوڕەویدا ، عێراق ئەندامی جامیعەی عەرەبییە .

تێبـ ــ ١ ) وەك ژابا نیشانی داوە دەنگی ( ن ) لە ئاوێستایی ئەم ووشــەیەدا (ن)ێکی گنە و ســوکە دەنگێکی (گ) لە پاش (ن)ەکەوە هەیە، هەروەك لە بن لەهجەی سلەیمانیدا بەدیدەکرێ . ب) ژابا ( تمـ : ــ ٢٢)ش و دوکتــۆر معینێش ( تە : فەرهەنگ . جا ــ ٣٧٢ ) جگە لــە ئازای لەش ئەم ووشـەیان بە ئامرازی نێرینەیی مانا لێداوەتەوە. ★ (سنـ.) ئەنام .

**ئەندۆ ــ** [ پە : هەندۆهـ ] ،(نا.) خەم و خەفەت ، پەژارە

□ « ئەوەند زاریێ کەرد جە ئەندۆی دەروون »
« خورۆش کەرد نــە ســەنگ قوڵڵەی بێستوون »
( خانا ــ ٤١٣ )

**ئەندەر ــ** [ ستە : ئەنتەرێ . پە : ئەندەر ] ، ( ئە . ) مانای ( دە ... ، لەناو ... ) دەبەخشێ و لە لەهجەی ناوەندیدا بێجگە لە یەك دوو کینایەدا نەبێ بەرچاو ناکەوێ و بە تەنیاییش نەبێستراوە . بــەڵام لــە لەهجەی باکووریدا ( هوندور ، هوندرو ) بــە مانای ( ژوورەوە ، داخڵ ) ماوە . ● یەکەندەر دوو ( یــەك ئەندەر دوو ) ، (کنـ.) کتوپڕ ، لە ناکاو .

**ئەندەروون ــ** [ پە : ئەندەروون ] ، (نا.) ، (کنیز.) ١ــ ژووری ماڵ ، ئەو بەشــەی مــاڵ کــە ژن و منداڵی لێدادەنیشن ★ حەرەم // بیروونی.

□ « یارم لە ئەندەروون هات دەستی ڕەقیب لە دەستا »
« غەمناك و شادمانم ڕەحمەت عەزابی هێنا »
( سالم : گە ــ ٣٥ )

٢ــ ناوەوەی هــەموو شــتێك ، ★ داخڵ. :: لە ئەندەروونی ئەشکەوتەوە هاتــــە دەر // دەرێ ، دەرەوە . ٣ــ ناوزگ ، دەروون . □ « میرزا تەها ! میرزاتەها ئەگەر ئــەمە ئــەو ئاوەمان خواردباوە و ئــەو عەقرەبە چووبا دە ئەندەروونمانەوە ئەندەروونی وەبـــەر نیشـــان دابـــاین تــــەکلیفی مـــــە چ بـــوو . »
( حوسێن ئاغای حــاجی خۆشــی )

تێبـ ــ ئــەم ووشـەیە لــە دووکەرتی ( ئەندەر ) و ( ڕوون ) پێکهاتوە بەشی دوەم ( ڕوون ) لە پەهلەویدا بە مانای ( لا ، تەرەف ... ) وەکوو پاشبەند بە کارهاتوە ، تە : ( فرە : پفا ــ ٣٨٩)، بەم پێیــە مانای ووشـەکە دەبێتە :

لای ناوەوە ، ژوورەوە .
**ئەندێش** ــ ١ــ ( نا . ) تمــ :
ئەندێشە . □ « هەر چەند دەکەم
فکر و ئەندێش، تەوەلابۆم لە قەوم و
خوێش » ( فۆلکلۆر ) . ٢ــ ( رێ .
فع . ) وەکوو پاشبەندێك لە تەرکیبدا
صفەتی فاعیلی دروست دەکا . ::
دوورەندێش ( ئـەو کەسـەی قوول
تێدەفکرێ ، وورد لێك دەداتەوە ).
تێب ــ ئـەوەندی پێم شـك بێ لـە
کوردیدا هەر ئەو تەرکیبە هەیە .
**ئەندێشە** ــ[پھ : هەندێشیشن]،
( نا.) ١ ــ بیـر ، خەیـالات . ٢ ــ
ترس ، غابیلە ، مەترسی ، واهیمە .
□ « ئای سلـەیمانبەگ عەدالـەت
پێشـە »
« لە دێوی کێـوی قـاف بـێ
ئەندێشە »
( پیرەمێرد ــ ٣٣٨ )
« فەرقـی ئینسـان و ، وولاغ
ئەندێشـەیە ، ئەندێشـەیە »
« بۆ نەمانی عەقل و ئیـدراك ،
مەی ، دزێکی کـاریبە »
( دلدار : گمــ ٢٥ )
★ ئەندێش/١ تێب ــ هەر چەنـدە
ئەم ووشـــەیە لـە ئەدەبیـــات و
فۆلکلۆری کوردیدا بەکارهاتوە بەلام
بە لای منەوە ووشـەیێکی فارسیـیە .
**ئەنـزەرۆت** ــ [ ؟ ] ، ( نـا.)
مادەیێکـە وەکوو جـەوی ، ڕەنـگی
سوور ، زەرد یا سپییە ، تامی تـالە
لە دارێکی دڕکـاوی کە گـەلای وە
گەلای مۆرد دەچێ دەگیـرێ . تم :
(معین : فەرهەنگ ، ج ١ ــ ٣٧٨ ) و
زیاتر لە هەتواناندا دە کاردەکرێ .

★ عەنزەرۆت ( معرّبە ) .
**ئەنعام** ــ [= عا : انعام] ، (نا.)،
(کێێر.) خەلات . ★ بەخشیش .
□ «کوتی : ئافەریم وەزیر ، ئەنعامی
بدەنبە وەزیری » ( تحفـە : جا ــ
٢٤٥ ) :: ئەوەندە زێرەکە تا ئێستا
چەند جار ئەنعامی وەرگرتوە .
**ئەنفلۆنزە** ــ [ ئیتالی ] ، ( نـا.)
نەخۆشییەکە ، بە هۆی (ڤیرۆس)ی
تایبەتی تووشـی ئینسـان دێـت و
(تا)لە پیـاو دێنێ ، هەنـدێ جـار
هەلامەتێشی دەگەڵـە و خەڵك لـە
یەکتـری دەگرنـەوە . تێب ــ ئـەم
ووشـەیە کە لەم نێزیکانەدا ــ لام وایە
لە ساڵەکانی ١٩٥٠دا ــ هاتۆتە ناو
زمانی کوردی ، ئەسـلی خۆی بـە
مەعنای ( کارتێکردن ، تەئسـیر ،
نفوز ) هاتوە و هیچ پێوەندی دەگەڵ
نەخوشێکە نیە ، کەچـی لە هـەموو
دنیادا هەر ئەم ناوە لە سەر زارانە و
( گریپ )کـە نـاوی عیلمـی ئـەم
نەخۆشێیە بە زمانی کەسدا نایەت.
**ئەنقەست** ــ [= عا : عن قصد]،
(بنت.) ١ــ بە ئارەزوو ، بە هـەوەس
بە تایبەتی . □ « . . . وەکـوو بـە
ئەنقەست بـۆ من وەسـتا بێـت
چاوەڕوانی ئـەوە بێت بزانـێ ئـەو
کارەی من ئەنجامی بە چی ئەگات »
(قەفتان : چێرۆك ــ ٣٣ ) . ٢ ــ بە
عەمدی ( یەکێك کارێك بکا و بزانێ
نابێ بیکـا و هـەر سوورێـش بـێ
لەسەرکردنـی ) . :: دوو سەعـاتە
لەوێ چەقیوە بە ئەنقەست نـاڕوا
★ ئانقەست .
**ئەنگافتن** ــ ( مصتـ. متـ.) ،

( کیـ.) تە : ئەنگاوتن .

**ئەنگافتە** ــ ( نمف.) ، (کیـ.) تە : ئەنگاوتە .

**ئەنگامە** ــ (نـا.) ، (مکـ.) ١ ــ زۆر و زەبەنـد ، کۆمەڵێکی زۆری خەڵك . □ « چـەند لەشـکرێکی ئەنگامەیـە ، بە قۆشـەن و بـە زەمزەمەیە » ( تحفە : ج١ ــ ٢٠٦ ). ٢ــ کار و کردەوە یا هەرا و هۆریای زۆر و سەرنج ڕاکێش (چ تاقە کەسێ بەرپای کا یا کۆمەڵە خەڵکێ ) . ★ هەنگامە ● تێبـ ــ من ئەم ووشـەیەم هەر بە ( هەنگامە) بیستوە .

**ئەنگاوتن** ــ ( مصت . مت . ) ١ــ بـەرد ، تێـر ، گوللـە و ... لـە نیشانەدان . :: فێشـەکی بە خەسار نەدەچوو هەر دەستی لـە پەلەپێتکە بـەردەدا یەکێکـی دەنگـاوت ، ( دەئەنگاوت ) . ئەو هەموو بەردەت هاوێشتێ نەتئەنگـاوت . هـەر دەیئەنگێوم بۆ کوێ دەچێ . ٢ ــ بە نەفەس و هێـزی ڕۆحی کەسـێك تووشی نارەحەتێ و گیروگرفت کردن. :: لێمان بۆنە شێخڕەش و شێخمەند هەر لەوەی ئازان یەکتری بنگێـون ( بئەنگێون ) ، باسی ئەم شەخسـە مەکە زۆر تۆڕەیە تا ئێستـا چەنـد کەسی ئەنگاوتوە ٣ــ ( مجـ.)دیتـن ، بەدیکردن . □« برایم خۆ من بـە قسـەی شـەیتانانم دەگەڵ نەکردێ ، لە رازی کانیبـەم بۆ خـۆم بەچـاو ئەنگاوتی » ( تحفە : ج ١ ــ ٣٧٦ ). ★ ئەنگافتن ، پێکـان ( مـاددێ و مەعنەوێ ) ، هەنگـاوتن . ( بکـ.) هەنگافتن . تێبـ ــ مانـای تەرکیبـی ئـەم ووشـەیە دەبێتـە : لێكنیزیك‌کردنـەوە ، پێکەوەبەنـد کردن. تە : ئەنجامە. **خۆئەنگاوتن**ــ ( مصت. لا.) لە کاتی ڕۆیشتنـا بە پاژنەی کەوشی لاقێك لـە گوێزینگی قاچەکەی تر دان و برێندار کردنی.

**ڕائەنگـاوتن** ــ [ ڕا ( پیـبف.) + ئەنگـاوتن ] ، ( مصت. متـ.) درێژکردنەوەی : پەت ، تەنـاف ، گوریس ، تـەل و ... لە نێـوان دوو یا چەند کۆلەکـەی چەقـاو یـا سینگی داکوتراو یا هەر شتێکی تری لەم بـابەتە . :: خێـرا تەنـافەکە ڕانگێوە ( ڕائەنگێـوە ) و جلەکـان هەڵخە ، هێشتا تەلی کارەبایان بۆ گەڕەکی ئێمە ڕانەنگاوتوە . تێبـ ــ بۆ تەلـی کارەبـا و تەلەفـۆن و ... ڕاکێشـان ( کمر.) و کێشـان ( کێر.) دەکوترێ کە لە فارسێ و عەرەبیڕا تەرجـەمەکراوە ، بـە لای منـەوە ( ڕانگاوتن ) زۆر لـە گوێنتـرە تـا کێشـان یا ڕاکێشـان .

**ئەنگـاوتە** ــ ( نمفـ. صمفـ. : ئەنگاوتن ) ، ( مک.) شتێ یا کەسێ کە هۆیەکی غەیرە ماددێ پێکابێتێ . :: ڕەببی ڕۆڵە ئەنگـاوتەبێ . کچێ دایکم ،حەکیمێ چێ ئەوە ئەنگـاوتە بـوە خێری بۆ لە خۆ بگـرن . ★ ئەنگافتە. هس: ئەنگواو ،ئەنگێوراو.

**ئەنگاوتەبـوون** ــ ( مصت. لا.) ، ( مک.) کتوپڕ نەخۆش‌کەوتن ، تووشی بەلایەك بوون ( بێ ئـەوەی هـۆیەکی دیارێ هەبێ ) .

**ئەنگران** ــ [ ؟ ] ، ( مصـ. لا.) ،

( مکـ.) لە خۆبایی‌بۆن ، لە پێستی خۆدەرچۆن ، پڕ بۆن . ئەم کابرایە هێند دەوڵەمەند بوە ئەنگڕاوە . هس : ـ ا ) ستـ : ئەنگرە ، بە مانای ئاڵۆز و ڕق ئەستۆر و دوژمن لە ووشەی ئەنگرۆ مەئینیەڤەدا = ئەنگرەمێنۆ = ئەهرێمەن . ب) ستـ : ئەنەغرە . پە : ئەنەغران بە مانای: پان و بەرین ، بەرفرەوان ، سەروبن نەدیار . تە : معێن ( فەرهەنگ : ج ا ـ ٣٩٦ ، فرە : پفا ـ ١٨ ) .

**ئەنگوان** ـ ( مصـ. لا.) ، ( مکـ.) بەرد ، تیر ، گوللە و . . . وێ‌کەوتن ، پێکران بە شتێکی ماددی . :: لە شەڕەکەی دوێنێ تەنیا دۆ کەس ئەنگوان . تێبـ ـ ئەم مەصدەرە لەوانەیە کە فاعیلی دیارنیە .

**ئەنگواو** ـ ( نمف : ئەنگوان ) ، ( مکـ.) تە : ئەنگێوراو .

**ئەنگوتك** ـ [ ؟ ] ، ( نا.) ، (مکـ.) بەشی نانێك هەوێر کە جیاکرابێتەوە و تۆپەڵ کرابێ بۆ ئەوەی پان‌کرێتەوە و بکرێ بە نان . ★ ( بکـ.)پەپك ، پەپکە . گونك ، گونتك .

**ئەنگوتك‌گرتن** ـ (مصتـ. متـ.) ، ( مکـ.) بەش‌بەش‌کردنی هەوێر ، هەر بەشەی بۆ نانێ ، کولێرە و . . . یەك و ئامادەکردنێ بۆ پان‌کردنەوە و کردنی بە نان . :: خێرا ئەنگوتکەکان بگرە تا تەندۆرەکە دادەمرکێتەوە ، ئەوە ئەنگوتکت نەگرتوە .

**ئەنگوچك** ـ [ ؟ ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) پارچەقوماشێکی سێ‌سوچی درێژۆکەیە ، بە قۆڵی کراسی پیاوانە و ژنانەی کوردیەوە دادەدروێ ، بۆ پێچانی سەردەست بەکاردێت . ★ ئەنگوچکەسۆرانێ ، فەقێیانە ، قۆچکە ، قۆچکەسۆرانێ، لەوەندێ . تێبـ ـ زەمانی قەدیم کە شەڕی تەن‌بەتەن باو بوە پیاوانی زۆر ئازا ئەنگوچکی کراسەکانیان ( چ بە سوارێ چ بە پیادەیی ) تێك‌گرێداوە و بەر بۆنە گیانی یەکتر، ئەمە نیشانەی ئەوە بوە کە تایەکیان نەکوژرێ دەست لێك هەڵنەگرن . هس : ئەنجامە .

**ئەنگوچکەسۆرانی** ـ [ ئەنگوچك + ٣ ـ ئە/١ + سۆرانێ ] ، ( نتـ.) تە : ئەنگوچك .

**ئەنگوس** ـ ( نا.) ، ( سنـ.) تە : ئەنگوست .

**ئەنگوست** ـ [ پە : ئەنگوست ] ، ( نا.) ، ( مکـ.) ١ـ هەریەك لەو پێنج ئەندامەی کە بە ئاخری دەست و قاچی ئینسانەوە بەندن . □«ئەنگوستی داکی خوازێم بە ڕێشە ئەنگوستی هەروەك درێشە » ( بەردەشانێ : ووردێ ـ ٣٨ ) ٢ ـ واحیدێکە بۆ دیاریێ‌کردنی ئەستورایێ و پانایێ شت. :: بە قەد ئەنگوستی گەورە ئەستۆر بۆ ، با دۆ ئەنگوست پانتر بێ . ★ ئەموست ، ئەنگوس، پەنجە ، قامك، ( بکـ. ) تلێ ، تبل ، ( جنو. جفـ.) کلك .

**ئەنگوستەچاو** ـ (صتـ.) ، (کنـ.) زۆر تارێك . □ « . . . نەدەچوە تێلەکۆ بە شەوی ئەنگوستەچاو سینگی خۆی بەگوللەوە نێت و

تاووس بۆ من بدزێ » ( قزلجـێ : پێکەنێن ـ ٥٢ ) . ★ ئەموستەچاو.

**ئەنگوستەوێلە** ـ [ ئەنگوست + ٣ـ ئە/٢ + وێلە ( ئیلە ) ] ، ( نـت.) تم : ئەنگوستێلە .

**ئەنگوستێلە** ـ [ ئەنگوسـت + ئیلە ] ، ( نت. ) ئالقەیێکی مەعدەنـە ( زیـاتر : زێڕیـازێو ) نەقیمێکـی بەردی بە نرخ ( یاقوت ، پـیرۆزە ، ئەلماس ... ) یا هـەر بەردێکـی دیکـەی تـێدەگرن و بـۆ جوانـی دەکرێتە پەنجەوە .

□ « تا بینە هەوالی دیدەمەستان »
« نەنگوسـتێلە دەرخـران لـە دەستان »
( هەژار : مەم‌وزین ـ ٢٩ )

★ ئەموستێلە ، ئەنگوسـتەوێلە ، کلکەوانە . **ئەنگوسـتێلەی دروومان** (نت.) ، (مک.) پارچە مەعدەنێکە لـە شێوەی کلاوی بەرزو ، بەلام قوولترە دێوی دەرەوەی کونج‌کونجـە ، لـە کـاتی درومـانا دەیکەنـە سـەری قامکەوە و پالی پێ بـە دەرزیـەوە دەنێن ، نـایەلێ قامکیـان دەرزی تێڕابچێ . ★ قوچەکە .

**ئەنگۆ** ـ [ ٢ـ ئە/٤ + هنگ + ئۆ ( ئە.) ] ، (ز.) ، (مک.) زەمیری نەلکـاوە بۆ دوەم کەسـی جەمـع (ئەوانەی قسـەیان دەگەل دەکرێ ).
□« ئەنگۆ چی فکر دەکەن ؟ ئەگـەر کەسێك صـەد مەڕی هەبێ و یەکێك لەوان وون بێ ئەرێ ئەو نەوەت و نۆی دە کێواندا بەجێ‌نایەلی ... » ( ئینجیل : مەتی ـ ٥٠ ) . ★ ئێوە، هەنگۆ . (بک.) هنگ ، هون ، فـە ، هەوە . هس : ئەنجومەن .

**ئەنگۆرە** ـ [ ؟ ] ، (بنت.) ، (مک.) ١ـ ئەو کاتە ، ئەو دەمە ، ئەوسـا پاشان ، دوای ئەو دەمە ، بەو پێیە.
□ «مەسـلەحەت ناکرێ بە زۆرە ، ئێوارە دابێ ، ئەنگۆرە تێی‌دەبێنێـن مەسلەحەتێ . » ( تحفـە : ج ٢ ـ ٣١٤ ) تێب ـ ژابـا ئەم ووشـەیەی بردۆتەوە سەر ( ئۆناگوێرە )ی ترکێ تم ( ل ـ ٢٣ ) بـەلام کوردوێیـف ( ئەنگۆرێ ) هەر بەو مەعنایانەی کە ژابا نوسـێوێتی وەك ووشـەیێکی کوردێ پێشان دەدا . تم : ( کف. ـ ٤٧ ) .

**ئەنگوتـن** ـ ( مـص. لا.) ١ ـ سـەردەرهێنان ، لە ئاسۆ دەرکەوتن :: گەلاوێژیش ئەنگوت کەچێ هێشتا گەرمایە . نەخێر هێشتا نەنگوتـوە ( نەئەنگوتوە ) ، سێ ڕۆژی دیکـەی مـاوە بنگـوێ ( بئەنگـوێ ) . ٢ـ دەستپێکردن ، هەلکردن ( با ) .

□ « وا زولفی لەسەر گەردنی لاچۆ بە هەناسەم »
« شەو فەجری بەیـان بۆ کـە نەسێمی سەحەر ئەنگوت »
( وەفایی : گە ـ ٢٦ )
« هەناسەم زولفەکەی لادا و و مەیلێکی نەکرد چاوێ »
« نەسێم ئەنگوت و شەو ڕابرد و نێرگس هەر لە خەودایە »
( نالی : گە ـ ٦٩ )

تێب ـ ئەم مەصدەرە هەر بۆ ئەم دۆ حالەتە بێستراوە بەکـارهێنرابێ ، نەگوتراوە ( کۆ ) ـ ئەوێـش هـەر ئەستێرەیە ـ ئەنگوت ، هەروەهـا

نەبێسراوە بڵێن ( شەماڵ ئەنگوت .

**تێکهەڵەنگـوتن** ـ [ تێـك ( دە + یەك ) + هەڵەنگوتن ] ، (مصت. لا.)، ( مک.) توشی یەکتر هـاتنی دو یـا چەند کەس و دەستە و لەشـکر .

**تێهەڵەنگوتن** ـ [ تێ ( دە + ی ) + هەڵەنگوتن ] ، ( مصت. لا.) ، (مک.) ١ـ توشی کەسێك بون :: لەسەری کوچەی خویان دە بارام هەڵەنگوتم . ٢ـ دەشـتێك هەڵەنگوتـن ( تمـ : هەڵە نگوتن ) :: لاقـی دە بەردێـك هەڵەنگوت هەر چابو ملی نەشکـا ، ئەوە دەچی هەڵەنگوتوی ؟ ، دارێك لـــەوێ بــو تێیهەڵەنگوتـــم .

**هەڵەنگوتن** ـ [ هــەڵ ( پێبف. ) + ئەنگـوتن ] ، ( مصت. لا.) لــە ڕێ ڕۆیشتنا توشی بەرد یا هەر جورە کوسپێکی تر بون ، کە پێـش بـە خێرایی لاق بگرێ و لای ژورەوەی لەش هەر لەســەر خێرایی خـوی بمێنێتەوە و بەو بونەیەوە سەرەنگرێ بون . :: چاوتان لەبەر پێی خوتـان بێ با هەڵنەنگـون ( نەئەنگـون ) ، وەیـــــە دوێنـــێ زور خـراپ هەڵەنگـوت ، یـاخوا ئـەو جـارە هەڵبنگوێ و لە ئەژنو بەرەژێـری وورد و خاش بێ . ٢ـ ( مجـ.) ، أ) توشی بەڵا بون ، خراپە بەسەرهاتن، گیروگرفت بو پەیدابون . ب) لـە کاراندا بە سەهو چون ، لە قسـەدا بەسەرچون .

**ئەنگێز** ـ ( ری. فعـ.) ، ( فر.) دەگەڵ هـەندێ ووشـەی کوردی تەرکیب دەبێ و حـالەتی فاعیلـی دەداتـــــێ . :: شەڕئەنگێـــز ، فیتنەئەنگێـز ، تێبـ ـ ئەو نـاوە فاعیلانەی بـەم ووشەیە دروسـت دەبن لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیـدا کەم نین بەڵام ئـەوی ڕاسـت بـێ هەروەك مەصدەرەکە ( ئەنگێزیدن ـ ئەنگیختن) فارسییە ئەم تەرکیبانەش هەر فارسین .

**ئەنگێزە** ـ ( نا.) هەر شتێکـی کە سێك هان بدا بو کردنی کارێك. باعث ، دافـع ( عـا. ) . هـس : نەقێزە .

**ئەنگێو** ـ ( ری. فعـ.) ١ـ شکڵی ( مضارع )ی ڕیشەی مەصـدەری ئەنگاوتنە . :: دەیئەنگێوێ ، چونی دەنگێوی . ٢ـ بـە دوای هەنـدێ نـاوەوە دەنوسـێ و دەیانکـا بـە تەرکیبێکی صفەتی فاعیلی . :: ماری شینی گائەنگێو ، خو ئەنگێو .

**ئەنگێـوران** ـ ( مصـ. لا.) تم : ئەنگوان .

**ئەنگێـوراو** ـ ( نمف. صمف. : ئەنگێوران ) ، (مک.) نەسـێکی بـە شتێکی ماددی ( بەرد ، گوللە ... ) پێکرابێ و ( فاعیل )ەکەش مەجهول بێ . ★ ئەنگواو .

**ئەنگێوە** ـ [ئەنگێو + ٢ـ ئە/٦]، ( نفـــا. صفـــا : ئەنگـــاوتن ) ، دەستڕاست ، کەسـێکی چاك لـە نیشانە بدا ، ئەوەی فێشـەکی بـە خەســار ناڕوا :: ئەنگێـوەی وەك ( ســمکو )ی هەرنـابێتەوە ، لـە مەحمودکانی جاندارێك هـەر بـە عاستەم سەری بە دەرەوە بو ، لـە دەستی دەرنەچو .

**ئەنوا** ـ [ ؟ ] ، ( نـا.) ، ( مک.)

١ـ پەنا ، جێگەیێکی پیاو خۆی تێدا بشارێتەوە ، شوێنی حەوانەوە . ٢ـ (مجـ.) مایەی بەرێ چوون و گوزەران . □ « ... هونەرمەندە گەورەکان لانەواز و بێ ئەنوا مانەوە ... » ( هێمن ) سەرەتای ( تحفە : جـ ١ ـ ١٢ ) .

**١ـ ئەو ـ** [ پە : ئەڤێ ، ئۆئی ]، (ز.) زەمێری سێیەم کەسی مفرەدە (غایب) □ « ... کە ئەو دەستی پێکرد کە حیساب بکا یەکێك بۆ کن ئەوێ هێندرا ...» ( ئینجیل : مەتێ ـ ٥١). ٢ـ زەمێری ئیشارەیە بۆ ( مشارالیه ) دوور .

□ « ئەورۆژە کە تۆرام و لە کەرکوك سەفەرم کرد »

« مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب حەزەرم کرد »

( رەزا ) .

٣ـ (مکـ.) تە : ئەم. ★ (بکـ.) ئەڤ. (مکـ.) هۆو .

**٢ـ ئەو ـ** (نا.) ناوی ئیشارەیە بۆ ( مشار الیه )ی مفرەدی دوور :: ئەو پیاوە لەبن دارەکە نوستوە ، ئەو ئەسپەتان لە کێ کڕیوە ؟ □ « ... ئاقڵ لە مێشکتدا نەماوە ، بە دیار ئەو پیرێژنە ڕەعیەتەوە ئەم قسانە دەکەی ... » ( قزلجی : پێکەنین ـ ٣٧ ) . تێبـ ـ کاتێ ( ئەو ) بە ناوی ئیشارە حیساب دەکرێ کە ناوێکی ( مشار الیه ) بەدوودا بیت ، ئەگەر وانەبێ (زەمیر)ە

**٣ـ ( ئەو ـ ) ـ** ( پیبـ . ) تە : ٢ـ ( ئاو ـ ) .

**ئەوا ـ** [ ئەوە + ئا ] ، ( شر. ) تە : ئەوەتا. □ « .. کەوشە کانێشم ئەوا بە حاڵ بە پێمەوە گیر دەبن..» (قزلجی : پێکەنین ـ ٣٦ ) . « ئەوا تۆ دەڕۆی بە نازەزای دڵ ، خودات دەگەڵ بێ مەنزڵ بە مەنزڵ » (فۆلکلۆر) .

**١ـ ( ـ ئەوار ) ـ** (پبتـ.) تە : ئەوەر . :: جۆقەوار ، خوێندەوار، هومێدەوار .

**٢ـ ( ـ ئەوار ) ـ** [ ٣ـ ئە/٢ + وار ( ئە : وێچوون ) ] ، (پبتـ.) بە دوای ناوەوە دەلکێ و دەیکا بە ناوێکی تازە و مانای (وەکو ، وێنەی ، چەشنی ) لێزیاد دەکا . :: دەستەوار . کۆلەوار .

**٣ـ ئەوار ـ** (نا.) تە : هەوار . تێبـ ـ ئەم ووشەیە وەك پاشبەند لە چەند ووشەیێکی کوردیدا دەبینرێ. :: لێرەوار ، شوێنەوار. (لێرهەوار ، شوێن هەوار ) .

**( ـ ئەواری ) ـ** [ ٢ـ ئەوار + ٢ـ ئێ] ، (پبتـ.) ١ـ بەدوای ڕیشەی مەصدەرەوە دەنوسێ و دەیکا بە حاصلمەصدەر :: خوێندەواری . ٢ـ بەدوای ناو یا صفەتەوە دەلکێ و دەیکا بە ناویمەصدەر :: کۆلەواری، کوردەواری ، کوێرەواری ( کوێرەوەری ) .

**١ـ ئەوان ـ** [ ١ـ ئەو/١ + ٢ـ ئان/١] ، (ز.) زەمێری نەلکاوی سێیەم کەسی جەمعە ( ئەو کەسانەی باسیان دەکرێ) و تەنیا بۆ ئادەمێزادە . □ « ... کە ئەوان دە ڕێیەدا دەچوون کەسێك

بەوێ گوت : هەر جێیەکی بچی وەدوای تۆ دەکەووم . »
(ئینجیل : لۆقا ــ ٣٩ ) . تێب ــ ئەم وشەیە وەکۆ جەمعی (١ــ ئەو/٢)ش بۆ غەیری ئادەمیزاد ، تەنیا وەکۆ ناوی ئیشارە ، ئەوێش لە هەندێ شوێنی کوردستان بەکار دێت . :: ئەوان کتێبانەم بۆ بێنە ، ئەوان ئەسپانە وەبەستە .

**٢ــ ( ــ ئەوان ) ــ** [ ٣ــ ئە/٢ + وان ] ، ( پبت . ) بە دوای ناوانەوە دەلکێ و دەیانکاتە ناوێکی تازە یا صفەت کە مانای پارێزگاری و ڕاگرتن لە ناوەکەی پێشو زیاد دەکەن . :: باغەوان ، بەرخەوان ، تۆتنەوان ، دەرکەوان ، ڕۆژوەوان ، دەشتەوان،

**ئەوانە ــ** [ ١ــ ئەوان + ٢ــ ئە/٢ ] ، (ز.) زەمێری ئیشارەیە بۆ جەمع:: ئەوانە کێ بۆن لە ماڵی ئێوە، ئەوانە بۆ کوێ دەبەی .

**ئەوتۆ ــ** [٢ــ ئەو + تۆ (طور) ]، [ کو. عا. ] ، (بنت.) ١ــ جۆرێك ، چەشنێکیوا ، شێوەیێك . ٢ــ (مج.) ، (صت.) شایانی باس . □ « ... وەکۆ هەوری بەهار بە گوڕ ئەهاتن بە خێرایێ تێ ئەپەڕێن و یادێکی ئەوتۆی پاش خۆیان بەجێ نەئەهێشت . » ( قەفتان : چیرۆك ــ ٤ ) . ★ وەتۆ .

**ئەوج ــ** (نا.) ١ــ بەرزێ ، بڵیندێ . ٢ــ بەرزترین شوێنی جێگا یا شتێك ، باڵاترین پایە .
□ « لە عەرسەی ئەوجی عەشقت بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا »
« بە بەرقی پەرتەوی حوسنت پەڕێ سۆتا لە طەیرانا »
( سالم : گە ــ ٣٥ )
«سیابازێك بۆم سیابازێك بۆم»
« لە ئەوجی گەردۆن تێژ پەڕوازێك بۆم »
( پێرەمێرد ــ ٢٣١ )
تێب ــ ئەم وشە لەسانسکرێتیدا ( ئوچچە )یە تە : ( معین : فەرهەنگ، جا ــ ٣٩٩ ) و لە پەهلەوێدا بۆتە (ئۆج)و ئەوجار عەرەبێ وەری گرتوە و کردۆیەتە ( ئەوج ) و سەرلەنوێ هاتۆتەوە ناو کوردێ و فارسێ . هس : (تو.) ئوجا .

**ئەوجا ــ** [ ١ ــ ئەو/٢ + جا (جار) ] ، (بنت.) ، (کی.) ١ــ کەوابۆ، کەوابێ ، لەو حاڵەتەدا ، لەحاڵێکی وادا . ٢ــ پاشان ، لەپاشان . □ « ... دەوجا ( دەئەوجا ) یا دەبێ ڕەخنەنەگرێ و بە تەواوێ خامۆش بێ ... » ( مەسعۆد : حاجێ ، ب١ ــ ٧ ) ★ ئەوجار ، ئەو جارەکە ، ئیمجا ، ئیمجار .

**ئەوجار ــ** ( بنت ) تە : ئەوجا . :: ئەوجار نۆرەی ئەو بەزم و ڕەزمەیە .

**ئەوجارەکە ــ** ( بنت . ) تە: ئەوجا .

**ئەوجاڕ ــ** [ ؟ ] ، ( نت. ) ، ( سەردەشت ) نیسبەت و پێوەندێ دۆ ژنان دەگەڵ یەکتری ، کە شۆیان بە دۆبرایان کردبێ . ★ هەوگیان هێوەرژن . تێب ــ من بۆ ئەوە دەچم کە ( جاڕ ) عەرەبێ بێ کە بە مانای هاوسێیە .

**ئەوڕاق ــ** [ = عا : اوڕاق

(ورق) ] ، (نـا.) ١ــ گـەڵای دار و درەختان .

□ « مەیلێ بکە بە سەوزە درەختانی مەدرەسە »

« ئەوڕاقیان مقدمـەیێ شـێنە یانەسوّر »

( نالی : مقبل ــ ١٧ )

٢ــ کاغەزی نوّسین ، کاغەزەکان . ٣ــ کوّمـەڵێ کاغەز کـە دەربارەی کەسێ شتێ یـا کار و مەسەلەیەك نوّسرابێ . :: ئەوڕاقەکانیان ناردوە بـوّ بـەغدا هێشـتا نەهاتوّتەوە . باش‌چاوەش ئەوڕاقەکانی ئەم کابرایە بێنە . **ئەوڕاقی ئیعتیماد ــ** ( نت. ) تە : ئیعتیبارنامە .

**ئەوڕوپا ــ** (نا.) ، (کعر.) تە : ئوّرۆپا .

**ئەوزاع ــ** [ = عـا : اوضـاع (وضع) ] ، (نـا.) ١ــ چلوّنایەتێ ، حاڵ و ئەحواڵ ٢ــ (مجـ.) چلوّنایەتێ ژیان و دارایەتێ کەسێك . :: لـە سایەی خواوە ئەوزاعی باشە .

**ئەوسا ــ** [ ١ــ ئەو/٢ + سـا (؟) ] ، (بنت.) ١ــ ئەو کاتە ، ئـەو دەمە . □ « ... ئەوڕەحمان تـوّ ئەوسـا گوتت ماسـتم هێنـاوە بێفروّشم ...» (قزلجی : پێکەنێن ــ ١٢٠ ) ، ٢ــ پاش ئەوە ، پاشـان ، پاش حاڵێ کە لـە پێشـدا باسـی لێ‌کرابێ . □ « ... منالەش ئەیدا زریکە و ژێر نەئەبوّوە هـەتا دایکە ئەیگرتـە بـاوەش ، ئەوسـا خێرا فرمێسکی ووشك ئەبوّ . » (قەفتان: چێژوّك ــ ٣ ) .

**ئەوشار ــ** (نمصـ.) ڕێك‌گوشێن .

تێبـ ــ ئەم ووشـەیە دەگەڵ مەصدەری ( ووشـێن ، کوشـێن ، گوشـێن ) ڕێشـەیان یەکە ، وەك ووشـەیێکی سەربە خوّ لە کوردێ ئێستادا دەکار نـاکرێ لـە تـەرکیبی : تـەڵای دەسـتەوشار ، گوّزەوشـاردا دەبیندرێ . رەنگە لەباتێ (ضغط)ی عەرەبێ خراپ نەبێ .

**ئەوشوّ ــ** [ ١ــ ئەو/٣ + شوّ (شەو) ] ، (مکـ.) تە : ئیمشەو .

**ئەوصاف ــ** [ = عا : اوصاف ( وصف ) ] ، (نا.) چلوّنایەتێ شتێ، ئەو نیشـانانەی شتێك یا کەسێکیان پێ دەناسرێتەوە. :: توّزێ ئەوصافی باس بکە ، بەو ئەوصـافانەی تـوّ دەڵەی هەردەبێ (سەعە) بێ .

**ئەوقاف ــ** [ = عـا : اوقـاف ( وقف ) ] ، (نا.) ١ــ هەموّ مڵك و زەوێ و زار و شتێ تر کە بـە پێی ڕێ و شـوێنی ئیسـلامەتێ بـوّ مزگەوت و تەکیە و خانەقایان یا بوّ خێر و خیراتی‌تر تەرخان کرابێ . :: مزگەوتی سـوّر ، لە دەوری بوّکان ئەوقافێکی زوّری هەبـوّ ، ئەوقافی غەوس دە حیساب نایە. ★مەوقوّفە وەقف . ٢ــ دایەرەیێکی دەوڵەتییە لە ووڵاتانی موسوڵمان بە ئێـش و کاری مەوقوّفە ڕادەگا .

□ « وەزیری ئەوقاف شێخ ئەحمەد داوود »

« چاخانەی داخست ، چایەچێ نابوّد »

( پیرەمێرد ــ ٢٧٠ )

**ئەوقە ــ** (نت.) ، ( سنـ. ) تە : ئاوقە .

**ئەوك ـ** ( نـا . ) ، ( مك. ) ١ـ
شوێنێکە لە نێـوان دەم و گەرووی
ئادەمیزاد ، زارکی گەرو . :: پاروی
دە ئەوکی گیرا ، درۆی ماسـی دە
ئەوکی مابۆ . ٢ـ (مج.) بەرانبەری
ئەو شوێنە ( ئەوك/١ ) ، بـەڵام لە
دێوی دەرەوە کـە دەکەوێتە نێوان
قوڕقوڕوچـکە و ژێرچـەنە . ::
دەستی دە ئەوکی نابۆ هێندەی نەمابۆ
بێخنکێنێ . تێب ـ لای پێشـەوەی
ئـەوك زمانەچکۆلەیە و ئـەو لاولای
( ئاڵۆ )ن ، لای سەرەوەشێ دەکاتە
دوایێ کونە لۆتان و لۆلەی هەناسە
( قصبة الرئة ) و ئـەو لۆلەی کـە
خواردنی پێـدا دەچێتـە وورگەوە
دەکەونە لای خوارەوەی .

**ئەولاد ـ** [ = عا : أولاد (ولد) ] ،
(نا.) ١ـ ڕۆڵە،منداڵ. ٢ـ نیسبەتی
منداڵ دەگەڵ دایك و بابێ خـۆی
□ « دێم ڕژا خـوێنی ئەولادەکەی
خۆم »
« بەسەرما ،ووتی جگەرگۆشەی
تۆم »
( سەلام ـ ١١٨ )
« لە پاش ئەو، ئەرشەدێ ئەولاد
شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت »
« بعەینـە وەك سـلەیمان
جێنشـینی حەزرەتێ داوود »
( ڕەزا ـ ١٥ )
★ عەولاد .

**ئەولیا ـ** [= عا : أولياء (ولي) ]،
(نا.) ١ـ پیاوچاك ، پیاوی خـوا ،
شێخیدێن ، شێخی بەرماڵ .
□ « ئەی لـە شەوقی جـەنەتێ
ڕۆت ، ئەولیا و ئەنبیا »
«ڕۆح لەسەر لێون وەکۆ پەروانە
بۆ دێداری شەم »
( وەفایێ : گە ـ ١٥ )
٢ـ (مج.) هەمۆ پیاوێکی ڕەووشت
چاکی بێ ئازار . :: جێی لێ نـەبێ
هەر دەڵەی ئەولیایە .

**ئەونە ـ** ( بنت . ) ، ( سن .) تە :
ئەمەندە .

**١ـ ئەوە** [١ـ ئەو + ٢ـ ئە/٢]،
(ز.) ١ـ زەمێری ئیشـاڕەی دیارە
(معرفة) بۆ مفڕەدی گیاندار و چتی
دوری غایب . :: ئەوەکێ بۆ تەقەی
کرد ، □ « ... ئەوەشم پێسەیر
بۆ !! چونکی ڕێبوارێش بەم جۆرە
شەوانە... » (مەم : چێرۆکەکانی ـ
٨٧ ) « ... من عـادەت و مادەت
نازانم هەر ئەوەیە پێم گوتێ ... »
(فزلجێ: پێکەنێن ـ ٣١). ٢ـ (مک.)
تە : ١ـ ئەمە .

**٢ـ ( ـ ئەوە ) ـ** (پبف .) ١ـ بە
دوایـێ هەنـدێ مەصـدەرانەوە
دەنۆسـێ و مەصـدەرێکی تـازە
دروستدەکا ،کە پێچەوانەی کارێکی
پێشو، یا دوپاتەکردنی کارێك پێشان
دەدا . :: گەڕانـەوە ( پێچەوانەی
ڕۆیشتن) ،ناردنەوە (هاتن و هێنانی
لە پێشدابوە ) ، نۆسینەوە (نۆسین
لەبەر شـتێکی نـوسراو ) ٢ ـ بـە
دوای هەنـدێ مەصـدەرانـەوە
دەبێنـدرێ ، وەکـو بەشـێکی
مەصـدەرەکە وایـە و ئـەگەر لێی
بکرێتەوە یا مەعنای دەگۆڕێ یا هەر
هێچ مەعنایەك نادات . :: پاڕانەوە،
لاڵانەوە ، شەکانەوە ، خواردنەوە ،
چەماندنەوە ، شـکاندنەوە . تێب ـ

ا) ئەم پاشبەندە لە لەهجەی باکۆریی و بنلەهجەی ( مەنگوڕیی )دا بە شکڵی ( ڤە ، وە ) لە پێشەوەی فیعل دێت . :: ڤەخۆ ، وەگەڕێ ، وەیبەستە ، وەی خوێنە . ب) من وای دەبینم کە ئەم پاشبەندە لە ( ئەپاچ )ی؟ پەهلەویی بە مانای : دیسان ، دووبارە ، پاش ، کەوتۆتەوە کە لە فارسیدا بۆتە ( باز ) .

**٣ــ ئەوە ــ** ( ئم. ) کەرتی تەواوکەری ئامرازە . ١ــ دەگەڵ ( بە ، دە ، لە ) بەکاردێت و ناوی مەبەست دەکەوێتە نێوانی هەردوو کەرتی ( بە ... ئەوە ) ئامرازەکە □ « مەمکت سێوە بە دارەوە ، خودا داویە مەیشارەوە . » ، «ڕاوەستاوە بە پێوە ، پاڵی داوە بە جێوە » ، « ڕێوی خۆی دە کونێوە نەدەچوو قلنگەلاشکی وەدوو خۆی دەدا» ، «لەو ڕوژەوە ڕۆیشتوە تۆراوە دای من». ٢ــ دەگەڵ (پێ، تێ، لێ) بەکاردێت. ا ) ئەگەر مەفعوول دیار بێ، دەکەوێتە پێشەوە هەردوو کەرتی ئامرازەکە تێکدەبنەوە و شکڵی ( پێوە ، تێوە، لێوە ) وەردەگرن . :: کونی دەرزێکە پچۆکە دەزۆی پێوە ناچێ ، لە لادێ کە سەمەنی دەکەن هەر ماڵەی چەنگە ئاردی خۆی تێوەدەدا ، کوا هەرچی تەماشا دەکەم هێچم لێوە دیار نیە . ب ) ئەگەر مەفعوول دیار نەبێ زەمیرێکی شەخسی دەچێتە نێوان دوو کەرتی ئامرازەکە . :: پێیەوە دیار نیە ، تێمەوە ڕاما و قسەی نەکرد ، لێتانەوە دوورە . تێب ــ ا ) لە بن لەهجەی سلەیمانیدا هەندێ جار [ ١ــ ( ــ ئانێ ) ]شی وەك تەواوکەرێکی دوەم بە دوادا دێت . :: لە ماڵەوانێ بۆم ، بە دەستەوانێیە بچێن . ب ) بە پێویستی دەزانم کە ڕوونیکەمەوە : پێ ، تێ ، لێ یەك بە دوای یەکا تەرکیبێکن لە ( بە +ی ) و ( دە + ی) و ( لە + ی ) کە (ی) زەمیری سێیەم کەسی مفرەدە .

**ئەوەتا ــ** [ ١ــ ئەوە + تا ]، ( شر.) تم : ئەمەتا . □ « ... ئەوەتا گێژێکی گەورە دە بەحرێدا بوو وەها کە گەمی لە شەپۆلان دادەپۆشرا ...» ( ئینجیل : مەتی ــ ٢٠ ) . « ... ئاخری مانگی ئەفەندی گوتی : کوا دەفتەری ماڵەوە ؟ ــ ئەوەتا . » ( قزلجی : پێکەنین ــ ٢٦ ) . ★ ئەوەتانێ ، ئەوەسا ، ئەوەسە .

**ئەوەتانێ ــ** [ ئەوەتا + ١ ــ ئانێ ] ، ( شر.) تم : ئەوەتا .

**ئەوەتەی ــ** [ئەوەتە + ی (ز.)]، ( شر.) لەو کاتەوە کە ... ( ڕستەی دوایی کاتەکە دیاری دەکا ) :: ئەوەتەی لە بەندیخانە هاتۆتە دەر کەم دوێ بوە . ئەوەتەی هەیە وای بە خۆیەوە نەدیوە . تێب ــ ١ ) گەلێ جاران (لە)ی لە پێشەوە دێ . ب) لە زمانی ئاویستاییدا ( ئەڤەتە ، ئەڤەتهە ) بە مانای : ( ئەوەندە ، هێندەزۆر و ئاوا ، ئەوجۆرە ، بەو چەشنەی ) هاتوە . تم : (ئەوڕەنگ: بەهرام ــ ١٨٧ ) . هەروەها (یەوەت) مانای ( تاوەختێکی ، هەرچەند ) دەدا . تم : ( پد : یگد ، ج٢ ــ ٢١٧)

★ ئەوەتێ ، لەوەتەی ، لەوەتــێ ، لەوەتا .
**ئەوەتێ** ـ (شر.) تە : ئەوەتەی.
**ئەوەجە** ـ [= عــا : حــوج ] ، (نــا.) ، (ســـند.) پێوێســـتێ ، پێداویستێ ، ئیحتیاج ، حەوجێ .
**( ـ ئەوەر )** ـ ( پب.) بە دوای ناوانەوە دەلکێ و دەیانکا بە ناوێکی تازە یا صفەت و مانای ( خاوەن )یان لێزیادەدەکا. :: بەختەوەر (بەخت)، پەلەوەر ( پەل ، پەڕ ) ، جــانەوەر (جان) ، چەنەوەر (چەنە) ، دەمەوەر ( دەم ) .
**ئەوەسا** ـ [ ١ـ ئەوە + سا ]، (شر.) تە : ئەوەتا .
**ئەوەسە** ـ [ ١ـ ئەوە + ســە (سا) ] ، (شر.) تە : ئەوەتا .
**ئەوەکە** ـ [١ـ ئەو + ١ـ ئەکە]، (ز.) زەمیری ئیشارەیە بۆ شتێکی وا کە ئەوانەی بــاسی دەکەن لە نێــو خۆیاندا دەزانن چیــە یا پێشـــوتر ناویان هێناوە . :: ئەوەکــەی تــۆ هێنابوت زۆر خراپ بو ، ( جمـ. ) ئەوەکان .
**ئەوەڵ** ـ [= عا : اوّل ] ، (نا.) ١ـ سەرەتای هەمــو شــتێك . :: ئەوەلی پایێز ، هێشتا ئەوەلی کارە. ☐ ئەوەڵ شام و ئاخر شام » . ٢ـ یەکەم ، لە پێش هەمو شتێکــدا . :: ئەوەڵ جار نیە کە جوامێر شتی وا دەکا ، جــاری ئەوەلێ پێم گوتــی وازی لێبێنە . هەر ئەوەلێ نەدەبو دۆستایەتێ بکــەی . ★ هــەوەڵ (بک.) عەوەل .
**١ـ ئەوەند** ـ (بند.) تە : ١ ـ ئەوەندە .
**٢ـ ئەوەند** ـ (ند. بند.) ، (مک.) تە : ٢ـ ئەوەندە .
**ئەوەندۆسکە** ـ [ ١ـ ئەوەند + ئۆســکە ] ( بنـــ.) ، (مکــ.) تمـ : ئەمەندۆچکە .
**ئەوەندۆکە** ـ [ ١ـ ئەوەنــد + ئۆکـــــە ] (بنتــ.) ، (مکــ.) تمـ : ئەمەندۆکە .
**١ـ ئەوەندە** ـ [ ١ـ ئەو/٣ + هەند + ٢ ـ ئە/٢ ] ، (بند.) ، (مک. سیمـ.) تە : ئەمەنــدە . ☐ « ... دەسا من ئەوەندە لە واقیع بێزارم وەختە ســوێم بێتــەوە بۆ خەوێکی خۆش ...» ( بلــە : ژان ـ ٩٧ ) ، «... حەز لە کچێك دەکــەم بەڵام ئەوەندەی دەکەم و دەکرێنم جوابم ناداتەوە ... » ( قزلجێ : پێکەنینی ـ ١٠٧ ) ● **ئەوەندەی بلەی یەك و دۆ** (کن.) خێرایێ زۆر . **ئەوەندەی مســت لە چــاواندەی** ـ ( کنــ.) خێرایێ ، توندوتۆڵێ .
**٢ـ ئەوەندە** ـ [ ١ـ ئەو/٣ + هەندە ( هەندەر = جێگا ) ] ، ( ند ، بند. ) ، (مک.) شــوینیکی دیــاری نیزیــك :: دەلــەی داری چــاکییە لەوەندەی چەقیوە // هۆوەنــدە . هس : هەندەران ، ئەوێنــدەرێ ، کوێندەرێ .
**ئەوها** ـ (بند. صت.) تە : ٢ ـ ئاوا .
**ئەوهە** ـ [ ١ـ ئەو + هــە ] ، (ز.) ، ( مک.) تە : ١ـ ئــەوە . ☐ « وەللاهی شەیتان رمۆزنە ، ئەمــن بە دەستی ئەوهەی دەچم .» ( تحفە:

ج ٢ ــ ٧٤ ) . تێبـ ــ أ ) کەرتی دووەمی ئەم ووشەیە ( هە ) تەحدیدێکی زیاتر لە ( ا ــ ئەوە ) زیاددەکا و بۆ ( مشارالیە )ێکی نیزیکتر بەکاردێت . ب) هە ، خۆی لە ئاوێستادا زەمیری سێیەم کەسی غاییبی مێیینەیە و نێرینەکەی ( ها )یە . تە : (پد : یگد ، ج٢ ــ ٣١٩ ) .

**ئەوەی** ــ [ ا ــ ئەوە/١ + ی (ز.) ] ، ( نا.) ناوی ئیشارەیە بۆ شتێك یا کارێك . □ « ئەوەی لە مشك ببێ هەمبانە دەبڕێ » (فۆلکلۆر) ، « ... بەڵام پێش ئەوەی من دەم هەڵبێنمەوە ، زابتێکی لاوی کەڵەگەت لە ژوورەکەی تەنیشتمەوە هاتەدەرێ ... » (بلە : ژان ــ ١٢٨).

**ئەوەیان** ــ ( نت.) تە : ئەویانە .

**ئەوێ** ــ [ ٢ ــ ئەو + ٤ ــ ێ ]، (ز.) زەمیری ئیشارەیە بۆ شوێنێکی دوور . // ئەمێ □ « ... بۆ کاروباری ئەوێ دایرەکیان دانا بە ناوی ...» ( قزلجی : پێکەنین ــ ٤٩ ) .

**ئەوێستا** ــ [ ٢ ــ ئەو + ئیست + ئا ( ٢ ــ ئە/٢ ) ] ، ( بنت.) ، ( مك.) تە : ئێستا □ « ئەو وەختێ هاتە کن شاگردان و بەوانی گوت : ئەوێستا بنۆ ن و بحەسێنەوە ...» ( ئینجیل : مەتێ ــ ٧٩ ) .

**ئەوێستاکە** ــ ( بنت.) ، ( مك.) تە : ئێستاکە .

**ئەوێستاکێ** ــ (بنت.) ، ( مك.) تە : ئێستاکێ .

**ئەوێندەرێ** ــ [ئەوێ + هەندەر + ٤ ــ ێ ] ، (بنت.) ، (مك.) تمـ : ئەوێ . تێبـ ــ أ ) بەشی دووەمی ئەم ووشەیە ( هەندەر )ەکە لە وشەی ( هەندەران )ی موکریانێدا بەمانەای ( جێگایان ) دەبێندرێ . ب) جەمعی ئەم وشەیە ( ئەوێندەرانێ )یە ، وشەیێکی ترێش هەیە کە ( ئەواندەران )ە .

**ئەویانە** ــ [ ا ــ ئەو + یە (یەك) + ئانە/١ ] ، (نت.) ناوی ئیشارەیە بو (ئەو)ێك لەناو کۆمەڵێ (ئەو)دا ، ★ ئەوەیان

**ئەوێتر** ــ [ ــ ا ــ ئەو + ا ــ ێ/١ + تر ] ، (نت.) ، (کعر.) تمـ : ئەوێکە .

**ئەوێدێ** ــ [ ا ــ ئەو + ا ــ ێ/١ + دێ ] ، (نت.) ، (مك.) تمـ : ئەمێکە .

**ئەوێدێکە** ــ [ ئەوێدێ + ا ــ ئەکە ] ، (نت.) ، (مك.) تە : ئەمێکە .

**ئەوێکە** [ ا ــ ئەو + ا ــ ئە/١ + ا ــ ئەکە ] ، (نت.) ، (کعر.) ناوی ئیشارەیە بۆ شتێکی معینی دوور ، کە لە ناو چەند شتێکی هاوچەشنی خۆیدا بە ئیشارە دیاریدەکرێ . ★ ئەوێتر .

**ئەهـ** ــ (ند.) ، (ئم.) بێزاری لە کاروکردەوە یا ڕۆداوێك دەگەیێنێ . :: ئەهـ ! دەوازێ لێبێنە کەیفی خۆیەتی چ دەکا یا بیکا .

**ئەها** ــ (ند.) ، (ئمـ.) بۆ راکێشانی سەرنج بەکاردێت . :: ئەها ! وەڵڵاهی شکاندێ . ئەها ! ئەگەر تۆشی بەڵایەك نەبۆی من هێچم

نەزانێوە .

**ئەهالێ** ـ [ = عا : اهالي (أهل)] ، (نا.) ١ـ هەموّ دانیشتوانی ئاوەدانییەك :: ئەهالییەکەی لێمان کۆبونەوە ، هەریەکە صەت‌پرسیاری لێدەکردێن .

□ « ئەوشاهی ماهی میسرە ئەهالێ
لە ریی سجوّد »
« قورئان دەڵێ کە بەندە ئەو ،
ئەم بەندە پەروەرە »
( نالێ )

٢ ـ (کعر.) ئەو کەسانەی کاربەدەستی حکوّمەت‌نێن .

**ئەهاو** ـ [ ٢ـ ئە/٣ + هاو ] ، (ئە.) ، (سنە.) تە : ئەهوّی .

**ئەهای** ـ [ ٢ـ ئە/٣ + های ] ، (ئە.) ، (سنە.) تە : ئەهوّی .

**ئەهرام** ـ [ = عا : اهرام (هرم) ] ، (نا.) سێ خانوّن لە نێزیك شاری قاهیرە فیرعەونەکانی ( میسر ) وەکو قەلاغ دروستیان‌کردوّن و دەوێدانێژراوون

**ئەهل** ـ [= عا : أهل ] ، ( نا.) ١ـ دانیشتوّی جێگایەکی ئاوەدان : مەلبەند ، شار ، دێ ، ماڵ . :: ئەهلی کەرکوك ، ئەهلی مەهابات ، ئەهلی شاربازێڕ رەزەوانی چاکن .

□ « ئەهلێکی وای هەیە کە هەموّ ئەهلی دانیشن » ( نالێ : گە ـ ١٩).

٢ـ لێوەشاوە ، لایق ، ئەو کەسەی بەکەڵکی جێبەجێ کردنی کارێك‌بێت. :: ئەهلی ئەم کارە نیە ، بوّ ئەم ئیشە لە شێرکوّ ئەهل‌تریان دەست ناکەوێ . ٣ـ ناوێکی بەشێوەی (ئیزافە) دەخرێتە سەر و بەتێکڕایی مانای ( تەرخان بوّ مضافەکە ) دەبەخشێ :: ئەهلی بازار ، ئەهلی کەیف ، ئەهلی خێر ( تە : ـ ) . **ئەهلی ئیمان** ـ ( نت. ) خوا پەرست ، ئیماندار .

□ « خوّمان بە ئەهلی ئیمان
ئەناسێن »
« کەچی ، کەچڕەوێن بوّیە
کەساسێن »
( پیرەمێرد ـ ٣٨١ )

**ئەهلی بازاڕ** ـ ( نت. ) ئەوانەی لە بازاڕ کاسبی دەکەن ، بازرگان و دوکاندار و ...

□ «دەستەیەکێ تر ئەوێش تجاڕە»
«سیلکی کاسبی و ئەهلی بازاڕە»
( پیرەمێرد ـ ٢٦٢ )

**ئەهلی تەقوا** ـ (نت.) ئەو کەسەی ملکەچی فەرمانی خوایە ، ئەوەی لە کار و کردەوەی پێچەوانەی ئاموّژگاری دین خوّی دەپارێزێ .

□ « لە سایەی توّ گەلێ کەس بوّن
بە عارف رێی خودایان گرت »
« درێغا عارفی رێگەی خوداو و
ئەهلی تەقواکەم »
( وەفایی : گە ـ ٣٨ )

**ئەهلی حاڵ** ـ ( نت. ) ئەو کەسەی لەبەر خواناسی ، جاروبارە دەبوّرێتەوە و گوّیا لەو حاڵەدا لەو شتانە ئاگاداردەبێ کە لە بارێکی ئاسایێدا نازاندرێن ، شێخ ، پیر .

□ « گەر ببینێ لێوی ئاڵ و چاوی
کاڵی مەستی توّ »
« مەست و بێپەروایە بیللا
پیری کامل ئەهلی حاڵ »
( سەلام ـ ٧٥ )

**ئەهلی‌خێر** ــ ( نت. ) ئەو کەسەی لەبەر موسوڵمانەتی و پیاوچاکی ، پاش مردنی خوا بێبەخشێ و پاداشتی چاکی بداتەوە . :: ئیشاڵلا ئەهلی خێرە . **ئەهلی دڵ** ــ (نت.) تم : ئەهلی حاڵ .

□ « قوللابی موژەت گرتمی ڕۆی‌کردمە ئەبرۆت »
« یەعنی کە ئەوە قیبلەنومای ئەهلی دڵانە »
( وەفایی : گم ــ ٧٨ )

**ئەهلی‌شەڕ** ــ ئەوەی لەم دنیایە گوێ‌نەداتە فەرمانەکانی دینێ و لە بەزەیی خوا بێ‌بەری بێ // ئەهلی خێر. **ئەهلی عەمامە** ــ (نت.) ئەوانەی مێزەر لەسەر دەبەستن ، زانای دینی ، مەلا و قازی و . . .

□ « ساقی وەرە تێکە سوڕاحی بدە ساغەر »
« بێ‌مۆیی دەماغی لە صەفی ئەهلی عەمامە »
( ئەدەب : گم ــ ٩٦ )

**ئەهلی قەناعەت** ــ (نت.) ئەو کەسەی ڕازی بێ بەوەی دەستی دەکەوێ .

□ « شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە نەقێری »
« بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندۆك »
( ڕەزا ــ ٢٩ )

**ئەهلی کەیف** ــ ( نت. ) ئەوەی هەمیشە حەزی لە بەزم و خواردنەوە و رابواردنی دیکە بێ .

**ئەهلی وەفا** ــ (نت.) ئەو کەسانەی چاکەی خەڵکیان لەبەرچاوە و لە بیریان ناچێتەوە .

□ « قیبلەی ئەمەلی ئەهلی وەفا تاقی برۆتە »
« هەر چەندە لە خوێنڕێژیی عاشق نیەتی جۆت »
( ئەدەب : گم ــ ٢٧ )

تێب ــ أ) ئەم جۆرە تەرکیبە دە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا زۆرن . تەنیا ئەوانە باس‌کراوون کە بەسەر زمانی خەڵکیشەوە هەن .
ب) هەمۆ (ئەهل)ەکان لە بن لەهجەی (سنەیی)دا دەبنە (ئال) :: ئالی‌کەیف (ئەهلی کەیف) .

**ئەهمیەت** ــ [ = عا : اهمیة ] ، (نا.) گرینگی ، بایەخ . :: ئەو جۆرەکارانە ئەهمیەتێکی ئەوتۆیان نیە ، جا ئەهمیەتی چیە با هەر قسەبکەن . **بە ئەهمیەتەوە سەیرکردن** ــ ( کەسێ ، کارێ ، شتێ ) تم : ئەهمیەت پێدان .

**ئەهمیەت پێدان** ــ [عا. کو.] ، ( مصت . لا. ) ١ــ بەهیندگرتن ، بایەخ پێدان ٢ــ (کن.) قەدر و حورمەت گرتنی کەسێ . :: وا دیارە ئەهمیەتێکی زۆریان پێداوە ، لەوە دەچێ ئەهمیەتی پێبدرێ . **ئەهمیەت پێ‌نەدان** ــ ( مصت . لا. ) بە هێچ زانین ، بێ‌قیمەت تەماشاکردن ، حورمەت نەگرتن . :: هەر ئەهمیەتیشی پێ‌نەداو نەیهێشت بچێتە ژوورەوە ، ئەم جۆرە قسانە ئیمڕۆ باویان نەماوە کەس ئەهمیەتیان پێ‌نادا .

**ئەهۆ** ــ [ ٢ــ ئە/٣ + هۆ ] ، (ند.) ، (ئم.) بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لە کاروکردەوە یا قسەی یەکێك . ::

ئەهۆ ! دەبڕۆ وازمان لێبێنە، ئەهۆ ؟
کوڕە دەبێبڕەوە . ★ ئەیهۆ .

**ئەهۆی** ــ [ ئەهۆ + ی (ز.) ] ، (ئە.) بۆ بانگ‌کردن. :: ئەهۆی کابرا ئەوە خەریکی چیت؟ ، ئەهۆی جوامێر تا ئێرە وەرە . ★ ئەهاو ، ئەهای ، هۆی/٢ .

**ئەهێو** ــ (ئە.) بۆ نیشاندانی باوەڕنەکردن ، یان گاڵتە بە قسەی یەکێك‌کردن . :: ئەهێو ! بە خوا بابە تەڕێ تێ‌نەگەیشتوی ، ئەهێو ! نامە خوا قسە لەوە باشتر هەرنابێ .

**١ــ ئەی** ــ (ئە.) ١ــ بۆ بانگ هێشتن و لەپێش ئەو ناوەدا دێت کە بانگی لێدەکەن .

□ « ئەی بولبولی بێدانە من و ئێوە
هەژارین »
« هەر دوێ وەکو یەك مونتەزیری
فەسڵی بەهارین »
( قانیع : گوڵاڵە ــ ٥٨ )

«... دەڵێن ئەی ڕەب : کەنگێ ئەتۆمان برسێ دێ ، یان تینو یان دە بەندیخانانداو خزمەتمان بە تۆ نەکرد ؟ » ( ئینجیل : مەتێ ــ ٧٥ )

٢ــ بۆ بانگ‌کردنێکی تێکەڵ بە مەترسێ ، خەفەت و سەرسوڕمان. :: ئەی ماڵێ وێرانم ، ئەی بابە ڕۆ ئەی لەو درۆیە. ★ ئای/٣ ،هەی.

**٢ــ ئەی** ــ (ئە.) ، (سیە.) تە : ئەدێ. تێب ــ ئەم وشەیە هەر (ئەدێ) یەکەیەو لەبن لەهجەی سلەیمانیدا (د)ەکەی کلۆربوە و بۆتە (ئەیێ) و ئەوجار بە جارێك سواوە و کەوتوە.

□ « ... ئەی چۆن ، کەس هەیە ئەوە نەزانێت کە تۆ سەرکردەیی...» (بلە : ژان ــ ١٢٢)، «... دێوەخان چۆڵ‌وهــۆڵ و ڕۆت و قــوت ، ووشترخانە ، ئەی چیە؟ » (قزڵجێ : پێکەنێن ــ ٣٨ ) .

**ئەیار** ــ (نا.)، (کعر.) پینجەمێن مانگی ساڵی فەڕەنگی ڕۆمییە ، دەکەوێتە نێوان نیسان و حوزەیران، سی‌ویەك ڕۆژە. ★ (کعر.) مایس، (کئێر.) مێهـ .

**ئەیاغ** ــ [ = تو : ایاق (قاچ) ] ، (صـ.) شتی خراپ و گەندە ( کاڵا ، مێوەو ...) کە لای دوکاندار بمێنێتەوە و نەفرۆشرێت. ٢ــ (نا.)، (کئێر.) زێرابی ئەدەبخانە .

**ئەیڕۆ** ــ (ئە.) تە : ئەیەڕۆ . :: ئەیڕۆ نەکەی شتی‌وات کوتبێ .

**ئەیلۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + لۆ (؟) ] ،(ئە.) ١ــ بۆ دەربڕینی هەستی خۆشەویستێ و لاواندنەوەی منداڵی پچوك . :: ئەی لۆ ڕۆڵە گیان چەند ژیرکەڵەیە ! ٢ــ بۆ گاڵتەپێکردن و بەڕاست نەزانینی قسەیە . :: ئەی‌لۆ ! تۆخوا بزانە گەزەگەزەی دەزانێ . ★ ئەیەلۆ .

**ئەیلوول** ــ [سوریانێ] ، (نا.) ، (کعر.) مانگی نۆیەمی ساڵی فەڕەنگێ ڕۆمییە دەکەوێتە نێوان ( ئاب ) و (تەشرینی یەکەم) ، سی‌ڕۆژە . ★ (کئێر.) سێپتامبر .

**ئەیوان** ــ (نا.) تە : هەیوان .

**ئەیهۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + هۆ ] تە : ئەهۆ . :: ئەی هـۆ چێ بەسەر چێوەیە تێب ــ دوپاتەکردنەوەی بێزاری زۆرتر پێشاندەدا .

**ئەیهۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + هۆ ]،

(ئە.) بـۆ دەربـڕینی بێبـاوەڕیی و نارازیتی :: ئەیهۆ « کەر لـە کوێ کەوتوە و کوندە لە کوێ‌دڕاوە » . تێب ـ دوپاتە کردنەوەی نیشـانەی بێبـاوەڕی و نـارازیتی تێکەڵ بـە تووڕەییە . :: ئەیهۆ ، ئـەیهۆ ! من چی پێدەڵێم و ئـەو چـم جـواب دەداتەوە .

**ئەیەڕۆ** ـ [ ١ـ ئەی/٢ + ٣ـ ئە/٢ + ڕۆ ] ، (ئە.) بـۆ دەربڕینی داخ و کەسـەری تێـکەڵ بە سـەر سـوڕمانەوە . □ « ... ئـەیەڕۆ ڕەشێد ! ئەوە چێت کرد ، چۆن ئەو فێڵەت دۆزییەوە ...» ( قزلجی : پێکەنینی ـ ١٠٨ ) :: ئەیەڕۆ بابانت خرابێ چۆن لە ڕۆت هەڵدێ قسەی وادەکەی . ★ ئەیڕۆ .

**ئەیەلۆ** ـ [ ١ـ ئەی/٢ + ٣ـ ئە/٢ + لۆ ] ، (ئە.) تە : ئەی لۆ .

**ئەیێ** ـ (ئە.) ، (سـیە.) تە : ئەدێ . هس : ٢ ـ ئەی .

**ئیبتیدا** ـ [ = عا : ابتـداء ] ، (بن.) لەپێشدا ، لە هەوەڵەوە، پێش هەمو شتێك ، سەرەتا .

□ «ئەوەڵ ئیبتیدا بە ئیسمی ئەڵلا»
« پـەس حـەمد و سـەنا
ئەلحەمدولیللا »
( عەقیدەی شێخ سەمێع )

**ئیبتیدایی** ـ [ = عا : ابتدائی ]، (ص.) حاڵی شتێك کە لە ڕیزا پێش هاوچەشنەکـانی خـۆی بێت . :: خوێندنی ئیبتیدایی ، مەدرەسـەی ئیبتیدایی .

**ئیبلیس** ـ [ عـا. لـە یونـانی وەرگرتوە : دیابولۆس = درۆزن ، دۆزمان ] ، (نـا.) ١ـ شـەیتان . ٢ـ (مج.) ، أ) ئـەو کەسەی بـە فێـڵ‌ودرۆ و دەلەسـە خـەڵکی هەڵخەڵەتێنی . ب) پیاوی زێرەك و زۆر زان کە زێرەکی خۆی زیاتر بۆ خراپە دەکارکا .

**ئیتاعەت‌کردن** ـ [ عا : اطاعة + کو : کردن ] ، (مصد. لا.) بە قسە کردن ، بەگوێ‌کردن ، مل‌کەچبون بۆ فەرمان . :: عەولاد دەبێ ئیتاعەتی دایك‌وبابیان بکەن ، هێنـدە چەوتە ئیتاعەتی خواش ناکا .

**ئیتتیحـادکردن** ـ [ عـا : اتحاد + کو : کردن ] ، ( مصد. لا.) ١ـ یەکگرتن ، بونەیەك ، پێکهێنانی یەکێتی . ٢ـ خۆکردنەیەکی چەند کەس یا چەند هەیئەتی کۆمەلایەتی و دەوڵەتان .

**ئیتتیفاق** ـ [ = عا : اتفاق ] ، (نـا.) ، (کێیر .) ١ـ ڕێـکەوت ، صدفە . ٢ـ ڕوداو ، حادیسـە :: ئیتتیفاقێکی سەیرە .

**ئیتتیفاق‌کردن** ـ [ عا. کو. ] . (مصد. لا. ) ١ـ قسەکردنەیەکی دو یا چەند کەس لە مەسەلەیەکدا. ٢ـ ڕێککـەوتنی دو یا چەند کـەس یـا هەیئەتی کۆمەلایەتی و دەوڵەت بـۆ مەبەستێك .

**ئیتتیهام‌کردن** ـ [ عا. اتهام + کو : کردن ] ، ( مصد. مت. ) تاوان وەپاڵ کەسێك‌دان .

**ئیتقات** ـ [ محر. عا : اعتقاد ] ، (مکـ.) تە : ئیعتیقـاد :: جا کەنـگێ حەمە شەڵ ئیتقاتی بە سـوێند و تەلاقی هەبوە ؟ ڕۆژی بیسـت جار

سێ تەلاقەی فڕێدا کەمە .

**ئیتمینانْدان** ـ [ عا : اطمئنان + کو : دان ] ، (مصد . مت . ) ١ـ خاترجەم کردنی کەسێك یا کۆمەڵێك ، دڵنیاکردنیان . ٢ـ ئەمێن کردنەوەی کەسێك لە مەترسێ .

**ئیتمینانکردن** ـ [ عا. کو.] ، (مصد. لا. ) باوەڕکردن بە کەسێ ، دڵنیابون ، خاترجەمبون . ★ ئیتمینان هەبون .

**ئیتمینانهەبون** ـ [ عا. کو. ] ، (مصد. لا.) تە : ئیتمینانکردن .

**ئیجارە** ـ [ = عا : اجارة ، ایجار ] ، (نا.) ، ( کئیز. ) ١ـ کاری ڕوبەڕوکردنەوە یا ڕوبەڕوبونەوە دەگەڵ کەڵك وەرگرتن لە ملك (خانو، باغ، دێ . . .) ٢ـ هەقێکی ئیجارەدار دەیدا بە خاوەنملك .

**ئیجارەدار** ـ [ عا. کو. ] ، (نت.)، ( کئیز. ) کەسێکە کە ملکێك بۆ ماوەیێك لە خاوەنی بە کرێ دەگرێ .

**ئیجارەکردن** ـ[عا. کو.] (مصد. مت. ) کاری بەکرێگرتنی ملکێك لە خاوەنی بۆ ماوەیەك ، بەرامبەر میقدارێك پارە ( حاصلاتیش ئەگەر باغ ، بێستان و . . . بێ ) ★ بە ئیجارەگرتن .

**ئیجارەنامچە** ـ [ ئیجارە + نامە + چە ] ، [ عا. کو. ] ، ( کئیز. ) تە : ئیجارەنامە .

**ئیجارەنامە** ـ [ ئیجارە + نامە ]، [ عا. کو. ] ، ( نت. ) ، ( کئیز. ) سەنەدێکە لە نێوان خاوەنملك و ئیجارەدارا ئاڵوگۆڕ دەکرێ و تێیدا دەنوسرێ کە ملکەکەی بۆ ماوەی چەندساڵ یا چەند وەرز بەدەست ئیجارە دارەوە دەبێ و چەند و چۆن پارە و حاصلات دەدا بە خاوەنی ملك . ★ ئیجارەنامچە .

**ئیجازە** ـ [ = عا : اجازة ] ، (نمصد.) ١ـ ماوەیکردنی کارێك بە کەسێك‌دان ، بە ڕەوازانێنی کارێك بۆ کەسێك . :: ئیجازەی هەیە دانیشێ ، ئیجازەی ئارەق‌فرۆشتن هەر بۆ مەسیحییەکانە ، ئیجازەمان بدە با بڕۆین ، قوربان ئیجازە بفەرمۆ سبەینێ بێینەوە . ٢ـ ڕێگەی کارنەکردن و نەچونە سەر ئیش بۆ ماوەیێك، کە دەدرێ بە کاربەدەست و کرێکار و سەربازان و . . . ★ مەرەخەسێ ، مەرەخەستێ . :: شێرکۆ حەوت ڕۆژی ئیجازە هەیە ، چەند ڕۆژێ ئیجازە وەربگرە و ئیشەکانت تەواوکە . **ئیجازەی مارگرتن** ـ ( نت. ) کارێکە شێخێکی تەریقەتێ قادرێ دەگەڵ دەروێش یا هەر کەسێکیتر دەیکا ـ دەدەمی دەتفێ ، یا پەنجەی دەدەمێ خۆی دەنێ و پاشان دەیخاتە دەمی دەروێشەکەوە . . . ـ و ئەمە بۆی دەبێتە ئیجازە ، پاشان دەروێش یا ئەو کەسە بەبێ‌ترس ماران دەگری و پێیەوە نادەن . **ئیجازەی مەلایەتێ** ـ (نت.) کاغەزێکە مەلایەك دەیدا بەو مەلایەی کە قوتابێ خۆی بوە و دەرسی پێ‌گوتوە ، شایەدێ بۆ دەدا کە خوێندنی تەواوکردوە و بۆتە مەلا (لێبۆتەوە) .

**ئیجبار** ـ [ = عا : اجبار ] ،

(نمصـ.) ناچاریێ ، زۆریێ ، تۆبزیێ .

**ئیجبارکردن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. متـ. ) ناچارکردن، بە تۆبزیێ کارێك بە کەسێك‌کردن .

**ئیجباریێ ــ** [عا. کو.]، ١ــ (صـ.) کاریێ‌بەزۆر ، کارێکی کەسێ لەژێر پاڵەپەستۆی یەکێکی‌تر دەیکا . ٢ــ (نتـ.) ، (کئێر.) خزمەتی سەربازیێ کە بەپێی قانۆن دەبێ هەمۆ کەس بۆوڵاتی خۆی ئەنجامێ بدا □ «... قەت بوە ئیجباریێ لە کوردی بگریێ».

**ئیجلاس ــ** [= عا : اجلاس] ، ( نا.) ، ( کئێر.) کۆبۆنەوەی هەیئەتێکی رەسمێ یا کۆمەڵایەتێ و ... بۆ وتووێژ دەربارەی کارێك یا چارەسەرکردنی گێروگرفتێ . :: ئیجلاسی کۆمیتەی ناوەندیێ ، ئیجلاسی ساڵانەی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان .

**ئیجماع ــ** [ = عا : اجماع ] ، (نمصـ.) ١ــ کۆبۆنەوە و رێك‌کەوتنی چەند کەسێ لەسەر کارێك . ٢ ــ هاوڕابۆنی کۆمەڵێ خەڵك لەسەر مەسەلەیەك :: ئیجماعی مەلاکان لەسەر ئەوەیە کە سەیید زەکاتیان پێ‌ناشی ، ئیجماعی نەتەوە یەکگرتوەکان لەسەر ئەوەیە کە ئیسڕائیل دەبێ خاکی عەرەبان چۆڵ‌کا ، بە ئیجماع ڕەئیاندا .

**ئیجماع‌لێکردن ــ** [ عا. کو.] ، ( مصتـ. متـ.) ، (کئێر.) گەلەکۆمەکێ کردن لە کەسێ یا جەماعەتێ . :: خەڵکی مەهاباد ئیجماعیان لە مەنگوڕان کرد و لە شارەکە وەدەرپان‌نان .

**ئیحتیڕام ــ** [= عا : احترام ] ، ( نا . ) رێز ، قەدر ، حۆرمەت .

**ئیحتیڕامی خۆڕاگرتن ــ** [ عا . کو.] ، (مصتـ. لا.) ١ــ رەفتارکردنی کەسێ بەجۆرێ کە خەڵك قەدری بزانن و حورمەتی‌بگرن ٢ــ ( کنـ.) بی‌ئەدەب نەبۆن . :: با ئیحتیڕامی خۆی راگرتبا و هیندەی قسەی زیادی نەکردبا تا وای بەسەرنەهاتبا.

**ئیحتیڕام‌گرتن ــ** [ عا. کو.] ؛ ( مصتـ. متـ.) قەدرگرتن ، رێزلێنان حورمەت‌گرتن ، قەدرزانین ، بە گەورەزانینی کەسێك و بە ئەدەبەوە دەگەڵی رەفتارکردن .

**ئیحتیلام‌بۆن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. لا.) شەیتانی‌بۆن ، لە خەوا ئاوهاتنەوە .

**ئیحتیمال ــ** [= عا : احتمال ] ، ( نمصـ.) ڕێ‌تێچۆن :: ئیحتیمالی هەیە ئەو ساڵ زستانی سارد بێ ، ئیحتیمالە هەر ئاگاشی لێ نەبێ ، بە هەمۆ ئەو ئیحتیمالانەشەوە هێشتا کردنی باشترە لە نەکردنی .

**ئیحتیمال‌دان ــ** [ عا. کو.] ، ( مصتـ. لا.) بۆ جێ‌بەجێ‌بۆن ( یا نەبۆن ) ، ڕۆدان ( یا نەدان )ی مەسەلەیەك ، کارێك و ... لە نێوان گومان و یەقین دا بۆن . :: لەم بابەتەوە هێچ ئیحتیمالێك مەدە ، ئیحتیمال نادەم لە توانایان دا بێ .

**ئیحتییات ــ** [= عا : احتیاط] ، (نمصـ.)١ــ دوڕئەندێشی لە کاراندا، حیساب بۆ پاشەڕۆژکردن . ٢ــ بە ووریایی و پارێز کارێك کردن .

**ئیحتییاتکار ــ** [ عا. کو.] ،

( صت.) ١ـ دوورئەندێش ، ئەو کەسەی بە پارێز کاران دەکا ، ئەوەی بێتر لە پاشەڕۆژی کاران دەکاتەوە . ٢ـ ( مج.) ترسەنۆك ( چونکو زیاد لە پێویست لێکی دەداتەوە و لە ترسی دواڕۆژ و ئەنجامی کارەکە ، دەستی ناچێتێ و لەبەری ڕانابەڕێ.)

**ئیحتییات‌کردن** ـ [عا. کو.] ، ( مصد. لا. ) ١ـ دوورتێفکرتین ، بە وورپایێ و پارێزەوە کارکردن . ٢ـ خۆپاراستن لە هەڵەشەیێ ، تالۆکەنەکردن . ٣ـ کارقایمێ پاشەڕۆژکردن .

**ئیحتییاتێ** ـ [= عا :١٠احتیاطی]، ( نا.) ، (کعر.) هەر شتێکی بۆ دواڕۆژ و ڕۆژی تەنگانە و مەبادا هەڵگیرابێ . :: وەکو دەڵێن ئیحتییاتێ‌نەوتی دنیا خەرێکە تەواو دەبێ .

**ئیحتییاج** ـ [= عا : احتیاج ]، (نا.) پێداویستێ ، پێویستنی شتێك . :: ئەگەر ئیحتییاجت پێ‌نەماوە کتێبەکەم بۆ بنێرەوە ، ئیحتییاجی بە خۆماندووکردن نیە . ★ ئاتاجێ ، ئەوەجە . ئیحتییاجێ .

**ئیحتییاج‌بوون** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصد. لا.) ١ـ هەستکردن بە کەمایەسێ بۆ شتێك . ٢ـ ( کنـ. ) نەقیربوون ، نەداربوون ★ موحتاج‌بوون .

**ئیحتییاجێ** ـ [ عا. کو. ] ، ( نا.) تم : ئیحتییاج .

**ئیحڕام** ـ [= عا : احرام ] ، (نا.) ، (مج.) دوو پارچە قوماشی سپێ نەدرواوە ، موسولمانان لە وەختی حەج‌دا یەکێکیان لە ناوقەدی خۆیان گرێ‌دەدەن و لە ناوك بەرەژێریانی پێ دادەپۆشن ، ئەوی دێکەش بەشانیان‌دا دەدەن .

**ئیحڕام‌بەستن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصد. لا. ) دەبەرکردنی ئەو جلکانەی شەریعەتی ئیسلام بۆ حەج دایناوە . تێبـ ـ پاش دەبەرکردنیان ، هەندێ کار هەیە ( سەرتاشین ، نینۆك‌کردن ، ... ) لە حاجییان حەرام دەبێ و نابێ بێکەن .

**ئیحساسات** ـ [ = عا : احساس ] ، (نا.) ، (کئێر.) ڕەدفیعلی ئینسان بەرامبەر قسە ، کارەسات و ڕوداوەکان . ★ (کعر.) عاتیفە .

**ئیحساساتی** ـ [ عا. کو. ] ، ( صـ.) ، (کئێر.) ئەو کەسەی کارەسات و ڕوداوەکان زۆ کاری تێدەکەن و هەڵدەچێ ، ئەوەی زیاتر بە دەنگی هەستەوە دەچێ تا عەقل . ★ (کعر.) عاتیفێ .

**ئیحساس‌کردن** ـ [ عا. کو. ]، ( مصد. لا.) هەستکردن بەو کارەساتانە کە لە لاوە ڕوودەدەن و لە دەروونی ئینسانا دەنگ دەدەنەوە و کاری تێ‌دەکەن :: قاچی سڕبوە ئیحساسی گەرما و سەرما ناکا ، کە لەسەر پشت ڕادەکشێ ئیحساسی ژان دەکا . ★ هەست‌پێکردن .

**ئیحسان** ـ [= عا : احسان ]، ( نمصـ. ) ١ـ چاکە . ٢ـ خێر و خێراتێ کە لە ڕێگای خودادا دەکرێ . :: خاڵە لە ڕای خوادا

شتێکمان بدەیە ئیحسانە. ٣ــ (کەر. کتو.) ناوە بۆ نێرینە .

**ئیحسان‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. مت. ) ١ــ چاکەکردن . ٢ــ یارمەتی‌دانی فەقیر و نەدار و سوالکەران بە پارە و ... :: هەقی خۆمانە کەچی دەڵەی ئیحسانمان پێدەکەن .

**ئیحیاکردنەوە** ــ [ عا : احیاء + کو : کردنەوە ] ، ( مصت. مت. ) ١ــ زیندوکردنەوەی مەعنەوی .

□ « مەلا سەعیدە وا سەلا ئەکا »
«ڕۆحی (بلال)مان بۆ ئیحیا ئەکا»
( پیرەمێرد ــ ٢٦٦ )

٢ ــ ( کنێر. ) ڕەونەق‌دان بە جێگە یا شتێك . □ « مالت ئاوەدان بێ باغەوان بۆ ئالوبالوت بازاڕت ئیحیاکردەوە » ★ بوژاندنەوە ، ژیاندنەوە .

**ئیحیانە** ــ [ محر ، عا : احیانا ]، (بن.) ئەگەر :: ئیحیانە چوی و لەوێ نەبو دانیشە تا دێتەوە . **ئیحیانەن** ــ (عا.) ، ( بن.) هەندێ جار ، جاروبارە، جارجار.:: ئیحیانەن پیاو وا لێ‌دەکا سەری لێ بشێوێ .

**ئیخباری‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. مت.) ، (کەر.) ئاگادارکردنی مێری لە کارێك یا دەربارەی شتێك. :: ئیخبارێیان‌کردوە کە ماڵی شێخ لەتیف بڕە لەوانەی لە کۆمەڵە ڕایان‌کردوە . ★ ( کنێر. ) ڕاپۆرت‌دان ، گوزارش‌دان .

**ئیخباری‌لێ‌کردن** ــ [عا. کو.]، (مصت. مت.) ، (کەر.) ئاگادارکردنی مێری دەربارەی کەسێ یا کەسانێ یا هەڵسان و دانیشتنیان . □ « بە مێرزا قادر بڵێن ئیخبارییان لێ‌کردوە خێرا بگەڕێتەوە سێتەك .» تێب ــ ئەم ووشەیە و ئەوی پێشەوەشی تەنیا بۆ مەبەستی خراپە بەکاردێن .

**ئیخبارییە** ــ [= عا : اخباریة]، (نا.) ، (کەر.) نامە یا هەر جۆرە نوسراوێکی بۆ ئاگادارکردنی مێری لە کار و چالاکی و هەستان و دانیشتنی کەسێ یا کەسانێ بنوسرێ . ★ ( کنێر.) ڕاپۆرت ، گوزارش .

**ئیختیلاف** ــ [= عا : اختلاف] ، (نا.) ، (کنێر.) ١ــ بەکڕانەبونی دو یا چەند کەس یا هەیئەت دەگەڵ یەکتری . ٢ــ جیاوازی چەندی و چۆنی دو یا چەند شت دەگەڵ یەکتر .:: ئەم ئیختیلافەی مەنگوڕ و مامەشان هەر نابڕێتەوە ، ئەمە لە کوێ و خەنجەری مام پێرۆتی لە کوێ هێندەی ئەرز و ئاسمان ئیختیلافیان هەیە . تێب ــ جەمعی ئەم ووشەیە ( ئیختیلافات )ە :: ئەو هەمو ئیختیلافاتەی ناو دەوڵەتان هەروا بە هاسانی لابەلاناکرێ .

**١ــ ئیختییار** ــ[= عا : اختیار]، (نا.) ١ــ دەستەلات ، توانست و دەستبەرەڵلایی بۆکردن و نەکردنی کاران . :: پاشام ئیختییارتان هەیە دەتوانن بشمانکوژن . ٢ ــ سەرپشك‌بون . :: ئیختییاری خۆتە چۆنت پێ خۆشە وا بکە . بە ئیختییاری خۆت کامەت بە باش زانی ئێمەش ڕازین . تێب ــ لە کوردستانی ئێران ، ئەم ووشەیە ئەگەر بە ڕاوێژێکی مەیلەوگاڵتە و بارەوسەر

سوڕمانەوە بکوترێ ، مەبەستەکـە پێچەوانـە دەکا و بۆ ئەو کەسـەی قسەی دەگەڵ دەکرێ بێدەستەڵاتێ دەگەیێنێ . **ئیختییارات ــ** ( جە .) هەمو ئەو دەسـتەڵاتەی لە لایـەن دەولـەت یا هەیئـەت و کەسـانی دەستەڵاتدارەوە بۆ جێبەجێکردنـی فەرمـانەکان دەدرێ بە هەنـدێ کاربەدەسـتان . :: فەرماندارەکان ئیختییاراتی تەواویان هەیە .

**٢ــ ئیختییار ــ** ( نا .) ، ( کمر .) ١ــ پیـر ، بـە سـالآچو . ٢ ــ ڕیش‌سپی ، کەیخودا □ « هەر لە گەورەیان هەتا منداڵان ، هـەر لـە منداڵان هەتا ئیختییاران » ( تحفە : ج٢ ــ ٢٦٢) :: ئیختییار و موختاری دێیەکە شـایەتێ بۆ دەدەن . تێبـ ــ وا دیارە ئەم وشـەیە لە تەشکیلاتی عوسمانێ کەوتۆتەوە ڕەنگە لە پێشدا هەر بەو کەسـانە گوترابێ کە بـۆ پێوەندێ دەگـەڵ کاربەدەسـتان و ڕاپەڕاندنی ئیـش و کاری خەڵـك دەست‌نیشان‌دەکران ، جـا چونکـە ئەوانە زۆریان بە سالآچوبون بۆیـە مانـای ( پیر و ڕیش‌سـپی )شـی لێ‌کەوتۆتەوە .

**ئیختییاردار ــ** [ ١ــ ئیختیار/١ + دار ( پب.) ] ، [عا. کو.] ، (صت.) ئەو کەسەی دەسـتەڵاتی هـەبێ ، ئـەوەی هەقـی کردن و نەکردنـی کارێکـی هەبـێ . :: خۆتـان ئیختیارداری ئێمە و ئەوانێشـن . باوك ئیختییارداری کچێ خۆیەتێ . □ «بای‌خەزاڵ ، عەمرم ، کێ لەسەر وولاتێ سۆرچێ و زراران دەکەیـە سۆرباش و ئیختییارداره » ( تحفە : ج ١ ــ ٣٥٠ ) .

**ئیختییارکردن ــ** [ ١ــ ئیختییار /٢ + کردن ] ، [ عا. کو.] ، (مصت. مت. ) هەڵبژاردن و پەسـندکردنی شتێك یا کارێك ... :: خۆتان ئەم ژیانەتان ئیختییارکردوە گلەیێ لـە کەس مەکەن. بە من بایە زەردەکەتان ئیختیار کردبا لەم شتێنە چاتر بۆ .

**ئیخڕاج‌کردن ــ** [ عا : اخراج + کو : کردن ] ، (مصتـ. متـ. ) ١ــ دەرکردن ، وەدەرنان . ٢ــ (کێر.)، أ) دەرکردنی کار بە دەستی دەوڵەت، کریکار و... لەئێش. ب) وەدەرنانی شـاگرد لـە مەدرەسـە . ج ) بەرەڵلاکردنی سەربـازی ئیجبـاری پاش تەواوکردنی ماوەی قـانونی . (عا.) تسریح :: دو مانگێش لـە دو سـالەکە تێپەڕیـوە کەچێ هـەر ئیخڕاجیـان نـاکەن . ٣ــ (کمر.) دەرهێنانی کالآ لە گومرگ .

**ئیخفال‌بون ــ** [ عا : اغفـال + کو: بون]، (مصت. لا.) فریوخواردن، هەلفریوان . ★ (بک.) هاتنەخاپێن.

**ئیخفال‌کردن ــ** [عـا. کـو.] ، ( مصتـ. متـ.) فریـودان ، هەلفریواندن ★ (بک.) خاپاندن .

**ئیخلاس ــ** [= عا : اخلاص ] ، (نا.) ١ــ دلپاکێ و دلسـوزێ لـە دوستـایەتیدا ٢ــ ڕاسـتێ و جگەرسوزێ لە کار و کردەوەدا . :: ئیخلاسمان هەیە بوتان . ئەم کابرایە هەر ئیشێکی پێی بسپێرن بەوپەڕی ئیخلاسـەوە دەیکا .

**ئیدارە ــ** [= عا : ادارة] ، (نا.)،

( کئێر.) بەشێك لە بەشەکانی هەر وەزارەتـێ کـە دەسـتەلاتی جێبەجێکردنی کارانی هـەیە . :: ئیـدارەی شـارەوانێ ، ئیـدارەی گومرگ . ★ (کمر.) دایرە .

**ئیدارەکردن** ـ [ عا . کو.] ، ١ـ ( مصد. متـ. ) هەڵسـوڕاندنی کار و بار . بەڕێوەبردنـی ئێـش و کاری شوێنێك . :: کەسێ ئیدارەی ماڵی خۆی پێنەکرێ ، ئیدارەی وولاتێکی چۆن پێدەکرێ . ٢ـ ( مصد. لا. ) هەڵکردن ، بەڕێوەچۆن . :: قوربان جەنابی قازێ بەم جۆرە ئیدارە ناکەم بفەرموو با تەڵاقم‌دا . دەڵەی بەرازە نازانم بەم سەرمایە چۆن بێ سۆبـە ئیدارە دەکا . هێند فەقیرە بە نانی ووشکێـش ئیـدارە دەکـا .

**ئیدارەدەگەڵ‌کردن** ـ [ عـا. کو. ] ( مصد. متـ. ) بەڕێوەچـوون دەگەڵ کەسێ ، هەڵکردن و سازان دەگەڵ خەڵك . :: هێندە دڕ و بێ حەیـایە کەس ئیدارەی دەگەڵ ناکا .

**ئیدارێ** ـ [ عا.] ، ( صە.) ١ ـ هەر شتێکی پێوەندێ بە ئیـدارەوە هەبێ . :: کاروبـاری ئیـدارێ . ئەمری ئیدارێ . ٢ـ أ ) ئەو کەسەی لە هەڵسـوڕاندنی کـاری ئیـدارە شارەزا بێ. :: قـەت متصرفی وا ئیدارێ نەهـاتۆتە کەرکـوك . ب ) کەسێکی لە هەڵسـوڕاندنی کاری ئیدارەدا ووشك و ڕۆتینێ بێ .

**ئیددیعا** ـ [= عا : ادّعـاء ] ، (نا.) ١ـ داوا :: ئیددیعای گەورەیێ . ئیددیعـای مەزنـایەتێ مەنگـوڕان کێشە و هـەرایەکی دروسـتکرد نەبێتەوە . ٢ـ بە نابەجێ خـۆ بـە شتێك زانین . فێشاڵ .

**ئیددیعاکردن** ـ [ عـا. کو.] ، ( مصد. لا.) ١ـ داواکـردن . ٢ـ وێستن یا وێستنەوەی شتێك لـە کەسێك . ٣ـ بەنوسین یا بە قسە ، لە دادگـا داوای شـتێ ( قـەرز ، نەفەقە، خوێن...) لە کەسێ‌کردن. :: بچۆ لای قازێ ئیددیعای نەفەقەی خۆت و منداڵەکەت بکە .

**ئیدڕاك** ـ [ = عـا : ادراك ] ، ( نمصـ . ) تێ‌گەیشتن ، حاڵی‌بوون ، □ « پەی چێش‌هەرکەسێ دەروونش پاکەن »

« نەجیبەن بێ عەیب ، صاحێب ئیدڕاکەن »

( خانا ـ ١٧٠ )

**ئیرادە** ـ [ = عا : ارادة ] ، (نا.) وێسـت ، خواسـت ، مەیل . :: ئیرادەی خوایە چێ دەگەڵ ناکرێ.

**ئیرادەت** ـ [عا.] (نا.) ، (کئێر.) دڵسۆزێ و ئیخلاس لە دۆستایەتیدا، دۆسـتایەتێ ڕاسـت تێـکەڵ بـە پچۆکایەتێ . :: ئیرادەتمان هەیـە ، عەرزی ئیرادەتی تەقدیم بکەن .

**ئیرادەتمەند** ـ [ عـا. کو. ] ، (صتـ.) ، (کئێر.) ئەو کەسەی زۆر دڵسـۆز بێ بەرامبـەر دۆسـت و ئاشنای خۆی . :: قوربان پیاوی وا ئیرادەتمەندم کەم دیوە .

**ئیرادەکردن** [ عـا. کـو. ] ، (مصد . لا. ) ١ـ بڕیـار هاتنەسەر کران و نەکرانی کارێ یا بوون ونەبوونی شتێ ، وێستن تێکەڵ بە دەستەلاتی جێبـەجێ‌کردن . ٢ـ لێبـڕان ،

بڕیاردان ، مەیل هاتنە سەر .

**ئیرس** ــ [ = عا : ارث ] ، (نا.)
١ــ ماڵ و دارایەت و هەمو شتی ماددێ کە لە پاش مردن بۆ کەس و کاری بەجێ دەمێنێ . ★ میرات .
٢ــ ڕێ و شوێن ، ڕەووشت و خو یا هەر شتێکی‌تری مەعنەوێ کە پشتاوپشت لە پێشونیانەوە بۆ بنەماڵ و خێزانێ، هۆز و عەشیرەتێ یا نەتەوەیێك دەمێنێتەوە . ★ کەلەپور .

**ئیڕتیجاع** ــ [عا.] ، (نا.) ، (کئیڕ.) ١ــ بۆ دواوە گەڕانەوەی شتێك ، وەکو پێشو لێهاتنەوەی . تێب ــ لە فیزیا و کیمیادا باسی هەندێ ئامراز و ماددە هەیە کە ئەگەر لەبەر یەکیان بکێشنەوە (سپرێنگ ، لاستیك ...) یا ڕێکیان بگوشن (ئیسفەنج...) هەرکە دەستیان لێ‌بەردرا دەگەڕێنەوە دۆخی پێشویان . جا ئەم وەکو خۆلێهاتنەوەیە پێی دەڵێن ئیڕتیجاع. ٢ــ (مج.) ، ( تە . ) بەربەرەکانێ شۆرشی کۆمەڵایەتێ و پێشکەوتنی کۆمەڵ و هەوڵ و تەقەلا بۆ ئەوەی ڕێژیمی سیاسێ و سیستێمی ئابوری کۆن لە جێی خۆیان بمێنن . ★ (کعر.) رجعیەت ، کۆنەپەرستێ .

**ئیڕتیجاعێ** ــ [عا. کو.] ، (صە.)
١ــ حالێ ئەو شتە ماددیانەی ئەگەر ڕابکێشرێن یا ڕێك‌بگوشرێن ، بە لاچونی ئەو هێزەی وای لێکردون ، وەکو خۆیان لێ‌یێتەوە . :: لاستیك ماددەیێکی ئیڕتیجاعییە . ٢ــ (مج.)، أ) ئەو کەسەی دژی پێشکەوتن و شۆڕشە و بۆ ڕاگرتن یا گێڕانەوەی ڕێژیمێکی کۆن تێدەکۆشێ★ (کعر.) ڕیجعێ ، (کئیڕ.) مورتەجیع . کۆنە پەرست . ب) ئەو بیروباوەڕانەی ڕێگای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتێ و ڕێژیمی نوێ دەبەستن . ★ کۆنەپەرستانە .

**ئیزافە** ــ [ = عا : اضافة ] ، (نا.) حاڵەتێکی ڕێزمانییە لە نێوان (٢) ووشەدا کە بە هۆی ئامرازی ئیزافەوە پێکەوە دەلکێن ( مضاف ومضاف الیه) ئەوجار مەعنایان تەواو دەبێ . :: کوڕی کێ ، خانوی شێرزاد ، گوارەی ئافتاو . تێب ــ ئامرازی ئیزافە لە کوردیدا (ئی) و (ئەی)ە کە بەدوای ووشەی یەکەمەوە دەلکێن و ( هەمزە )کەیان دەسوێ و دەنگی دەرناچێ .

**ئیزافەکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصد. مت. ) لێ‌زیادکردن ، خستنە سەر ، زیادکردنی شتێك لە شتێکی‌تر . :: پارەی ئەم کراسەش ئیزافەی حیسابی کۆن بکە. لە صەتا دو قازانجی ئیزافە بکە بەسە ، ئیزافەی سەر ئەوانی ترێکە .

**ئیزڕائیل** ــ [ محر . عیبرێ ] ، (نا.) ١ــ ئەو فرشتەیەی گیانی ئادەمیزاد دەکێشێ . ٢ــ (مج.) ، أ) پیاوی بە سام، ئەو کەسەی یەکێك یا زیاتر لێی بترسن. ب) ئەو کەسەی لەبەر دڵی کەسێ یا کەسانێ ناخۆشەویست و دزێو بێ . :: وەك ئیزڕائیل ببینم وایە ، هەر دەڵەی ئیزڕائیلە . تێب ــ ئەوێ ڕاست بێ ئەو خوێندەوارانەی دەنگی (ع)یان

لە زمانی کوردیدا بە دڵ نیــە ، ئەم وشەیــان بەم دەردە بردوە دەنــا خەڵکی لادێ هەر (عیزڕائیل) دەڵێن ★ عیزڕایل . مەڵکەمۆت ( ملك الموت ) .

**ئیزڕاب** ــ [ = عا : اضراب ] ، ( نمصـ. ) ، (کعر) ١ــ ڕۆ وەرگێڕان ٢ــ (مجـ.) دەست لە کار هەڵگرتن و کۆبونــەوەی کۆمــەڵێ خــەڵك بــۆ دەستخستنی هەندێ داوا ،یا وەدێ هێنانی هیندێ ئامانج ( ئازادێ ، کەم کردنەوەی سەعاتی ئیشی کرێکاران، زیــادکردنی ڕۆژانــە و .... ) یا دەربڕینی نــاڕەزایی بەرامبەر بــە شــتێك ، کارێك یا ڕوداوێ . ★ مانگرتن . (کێیز .) ئیعتیساب .

**ئیزن** ــ [=عا : اذن] ، (نا.) ئیجازە، دەستور . :: لە ئێمەوە ئیزن بە ، تۆ ئیزنت بە دەستی خۆتە ، بــە بێ ئیزن بۆ هێچ کوێ نەچی □ « ... مەرکەبی سەگلاوێ لە ئێختەخانەی دێنــا دەرێ بــە ئیــزنی خــولا و پێغەمبەری لێ‌دەبۆسوارە » ( تحفە : ج ٢ ــ ١٩٦ ) .

**ئیزن خواستن** ــ [ عا. کو. ] ، (مصد. لا. ) ١ــ داوای ئیجازەکردن بــۆ کردنی کارێك :: ئیزنمــان لــە مامۆستا خواســت و هاتینــەوە ، دەبوایە ئێزن بخوازی نەك سەربەخۆ لێدەی بڕۆی . ٢ــ داوای ئیجازەی ڕۆیشــتن لــە خانــەخوێ‌کردن ، خــواحافێزیێ‌کردنی میــوان لــە خانەخوێ . :: ســێ ڕۆژ میوانیان بۆین هەر ئیزنمان دەخواست ئیزنیان نەدەدایین .

**ئیزندان** ــ [عا. کو.] ، (مصد. متـ.) ١ــ ئیجازەدان ، ڕێگادان بــە کەسێ بۆ کردنی کارێك.::باغەوانەکە خۆی ئیزنی داین ئەم تووە بتەکێنین . هەرچــەندی بەهانــەی هێنایــەوە مامۆستا هــەر ئێــزنی نەدا . ٢ــ بەرەڵڵاکردنی قوتابێ و کرێکار و... لە قوتابخانە و لەسەر ئێش پاش تەواوبۆنی خوێندن و کاری ڕۆژانە. ٣ــ دەرکردنی کرێکار و کاربەدەست لەسەر کار . □ « قــادر ! بزانە و تاوزەند ، چەند ڕۆژی ئێش کردوە پارەکەی بدەیە و ئیزنێ دە » . ٤ــ ڕازیبۆنی خانەخوێ بــە ڕۆیشتنی میوان . :: ئەوە بۆ هێندە پەلەتانە ؟ یەك‌دوڕۆژی دیکەش لێرە بن ئــەو وەختــێ ئیزنتــان دەدەیــن و خواحافێزتان بێ .

**ئیزهارکردن** ــ [ عا : اظهار + کو : کردن ] ، ( مصـد. متـ. ) ١ــ ئاشــکراکردن ، خــستنەڕۆ ، وەڕۆخستن. ٢ــ گوتن، بەیانکردن.

**ئیزهارنامە** ــ [عا. کو.] ، (نتـ.)، (کێیز.) کاغەزێکە بازرگان و کاسب چلۆنایەتێ کار و کاسبی ، قازانج و زیانی خۆیانێ تێدا دەنۆسن و دەیدەن بە ئیدارەی مالیــات بــەردەرامەت ( ضریبة الدخل ) ، یا دەربارەی ئەو کاڵایانەی لە دەرەوە بۆیــان هــاتوە دەیدەن بە گومرگ .

**ئیسپاتبۆن** ــ [ عا : اثبات + کو : بۆن ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصد. لا. ) ڕۆنبۆنــەوەی ئیددیعایەك بــە دەلیل و بەڵگە . :: بۆمان ئیسپات بۆ کە قەرزدارە .

**ئیسپات‌کردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصد. مت. ) دەرخستنی ڕاستی ئیدیعایەك . :: دەفەرمۆ بزانین چۆنمان بۆ ئیسپات دەکەی .

**ئیستراحەت** ـ [ = عا : استراحة ] ، (نا.) تە : ئیسڕاحەت.

**ئیستیخارەکردن** ـ [ عا : استخارة + کو : کردن] ،(عا. کو.)، (مصد. مت.) فاڵ گرتنەوە بە قوڕئان یا تەسبێح یا هەر شتێکی‌تر بۆ ئەوەی بزانن کردنی کارێك باشە یان نا .

**ئیستیخبارات** ـ [.عا. ] ، (کعر.) ، ( مصد. مت. ) خەبەر وەرگرتن ، گەڕان بە شوێن دەنگ و باساندا ٢ـ ( نا. ) دایرەیێکە بو کۆکردنەوەی دەنگ‌وباس و پاراستنی سوپای هەر دەولەتێك . ★ (کئێر.) ڕۆکنی دۆ .. ٣ـ (مج.) ئەو کەسەی لەم دایرەیەدا ئیش دەکا .

**ئیستیخدام‌کردن** ـ [ عا : استخدام + کو : کردن ] ، (مصد. مت.) ڕاگرتنی کەسێ بۆ کردنی کارێ، ڕاگرتنی یەکێ و کردنی بە کاربەدەستی دەوڵەت .

**ئیستیشهاد نامچە** ـ [ عا : استشهاد + کو. فر : نامچە ] ، (نت.)، (کئێر.) تە : ئیستیشهادنامە.

**ئیستیشهادنامە** ـ [عا. کو. ] ، (نت.) ، (کئێر.) کاغەزێکە چەند کەس مۆری دەکەن و دەربارەی مەسەلەیەك یا کارێك شایەتی دەدەن ★ (کعر.) مەزبەتە .

**ئیستیعداد** ـ [= عا : استعداد]، (نمصد.) ئامادەیی ، سازی :: ئیستیعدادی هەیە تابەیانی دانیشێ، ئیستیعدادم نیە هەر قسەشیان دەگەڵ بکەم .

**ئیستیعفادان** ـ [ عا : استعفاء + کو : دان] ،(مصد. لا.) ، (کئێر.) تە : ئیستیقالەکردن .

**ئیستیعمار** ـ [= عا : استعمار = ئاوەدان کردنەوە] (نا.) سیاسەتی داگیرکەرانەی دەولەتە سەرمایەدارەکانە بۆ تالان کردنی دارایەت و سامانی وولاتانی دیکە و کەڵك وەرگرتن لە باری ئابووری و ئیستراتیژی ئەوان وولاتانە . ئەم سیاسەتە لە دەورانی ئیمپریالیزما دەگاتە دوایلەی خۆی . ( کورتەی قامۆسی سیاسی ، موسکۆ ، ل ـ ١٠٩). دەستەڵاتی وولاتێکی زۆردارە بە سەریەکی بێ زۆردا ، بۆ کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە خۆ ڕسکاوەکان و دارایەت و هێزی ئینسانی خەلکەکەی ، بە بەهانەی نابەجێی ئاوەدان‌کردنەوەی وولات و پێشخستنی نەتەوەکەی ( معێن : فەرهەنگ، ج١ ، ل ـ ٢٥٣). ڕێ و شوێنێکی ئیمپریالیستییە کە بۆ خۆشی ژیانی نەتەوە ئیستیعمارچییەکان نەبێ هێچ گوێ ناداتە ئاوەدان‌کردنەوە ( لاڕۆس : ١٩٦١ ، ل ـ ٢٢٧ ) . تێب ـ أ) ئەم ووشەیە کە دەق بە مەعنای ( کۆلۆنیالیزم )ی فەڕەنگییە تا ئەم ساڵانەی دواییش بۆ ( کۆلۆنیالیزم ) و ( ئیمپریالیزم ) هەردوکیان بەکار دەهێنرا ، بەڵام ئێستا فەرقیان دەکرێت . ب) تەحدیدی وورد و عیلمی ئیستیعمار

تەنیا لە لایەن مارکسیستەکانەوە و لەنوسینی ئەواندا بەرچاو دەکەوێ و خەڵکی‌تر موتلەقی داگیرکردن و چەوساندنەوەی وڵات و نەتەوەیەك لە هەمو دەور و زەمانێکدا ــ نەك هەر لە قوناغی سەرمایەدارێدا ــ بە ئیستیعمار دادەنێن ، جاداگیرکەر کێ دەبێ ببێ و چ ناوێك لە کردەوەکەی خۆی دەنێ و چ بڕ و بیانوێك دێنێتەوە بۆ تالان‌کردنی سامانی نەتەوەکە ، کەیفی خۆیەتی .

**ئیستیعمارچی** ــ [ عا. تو. ] ، (صفا) ، (کئیر.) ئەو دەوڵەتەی وڵاتێکی‌تر داگیردەکا و نەتەوەکەی دەچەوسێنێتەوە و دارایەت و سامانی بە تالان دەبا . :: دەوڵەتە ئیستعمارچییەکان لە ٢٥ ساڵاندا ئاگری دو شەڕی گەورەیان هەڵگیرساند .

**ئیستیعماری** ــ [ عا. کو. ] ، ( ص. ) ١ــ هەر شتێکی پێوەندێ بە ئیستیعمارەوە هەبێ . :: سیاسەتی ئیستیعماری، پیلانێکی ئیستیعماری، بیروڕای ئیستیعماری. ٢ــ هەرکەس یا هەیئەت یا دەوڵەتێکی بە پێی سیاسەت و ڕێ و شوێنی ئیستیعمار بجوڵێتەوە . :: ئەڵمانیای نازی دەیەویست جێگەی ئەڵمانیای ئیستیعماری پێش شەڕی یەکەم بگرێتەوە .

**ئیستیعمال‌کردن** ــ [ عا : استعمال + کو : کردن ] ، (مصت. مت. ) دەکارکردن بەکار هێنان . :: ئەو دەرمانانە ئیستیعمال‌کە و کە تەواوبون وەرەوە لام . ئەرێ خۆ تۆ ئەم ڕادیۆیە ئیستیعمال ناکەی دە بیدە بەشێرکۆ . ئێمە ڕۆنی گیبا ئیستیعمال ناکەین .

**ئیستیفادەکردن** ــ [عا : استفادە + کو : کردن ] ، (مصت. مت. ) ١ــ کەڵك وەرگرتن ، فایدە وەرگرتن (لە کەسێ یا شتێ ) . ٢ــ قازانج کردن (لە سەودا و مامەڵە،وەزیفە و هەمو جورە چالاکیێکی لەم بابەتە ، بە ڕەوا و ناڕەوا ) . :: ئەم هەمو دەرمانەم خوارد هێچ ئیستیفادەشم لێ‌نەکرد ، لەم دەستەکڕێ و لەو دەستە فرۆشتیەوە صەد دیناری ئیستیفادەکرد .

**ئیستیقالەدان** ــ [ عا : استقالة + کو : دان ] ، ( مصت. لا. ) (کمر.) تە : ئیستیقالەکردن .

**ئیستیقالەکردن** ــ [ عا . کو. ] ، (مصت. لا. ) ، (کمر.) ١ــ واز لە وەزیفە و ئیشی دەوڵەت هێنان . ٢ــ واز لە ئەندامەتی کۆڕ و کۆمەڵەی سیاسی و کۆمەلایەتی و ... هێنان . ★ ئیستیفادان ، ئیستیقالەدان .

**ئیستیقبال** ــ [ = عا : استقبال ] ، ( نمص ) تە : ئیستیقبال کردن

□ « مەزانۆ مەیۆ بە ئیستیقبالت »
«زەرۆرەن بە دێن جەمێن لاڵت»
( خانا ــ ٨٧ )

**ئیستیقبال‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. مت. ) ١ــ بەرەوپیرچون پێشوازکردن . ٢ــ بە خۆشی وەرگرتنی قسە یا کاری کەسێك .

**ئیستیقلال** ــ [ = عا : استقلال]

(نا.) سەربەخۆبوون و ئازادی تەواوی وولاتێك لە کاروباری سیاسی و ئابوری و ... بێ ئەوەی بێگانە ( چ بە ئاشکرا چ بە نهێنی ) دەستەلاتێکی هەبێ و دەست دە کاران وەربدا .

**ئیستیکان** ـ [ لەڕوسی : ستەکان ] ، (نا.) دەفرێکی پچوکە لە شوشە دروست دەکرێ و چای پێ دەخورێتەوە .. ★ (کعر.) پیالە .

**ئیستیلاح** ـ [= عا : اصطلاح]، (نا.) ، ( کئێر. ) ووشە یا رستەیێکە کە بۆ مەبەستێکی تایبەتی تەرخان دەکرێ :: زاویەی قایمە ئیستیلاحێکی هەندەسەیە، تەقاندنی ئاتۆم ئیستیلاحی فیزیکییە ، دەستنوێژ ئیستیلاحی دینی ئیسلامە . **بەئیستیلاح** ـ ( کئێر. ) گۆیا ، هەروەك دەلێن ، وەکو دەگوترێ . تێبـ ـ زیاتر بۆ گاڵتەکردن بە قسەی کەسی یا بەڕاستنەزانینی بەکاردێت . :: بە ئیستیلاح تۆبەی کردوە ئیتر قومارناکا .

**ئیستینتاق کردن** ـ [ عا : استطاق + کو : کردن ] ، ( مصت. مت.) ، (کئێر.) وە قسە هێنان ، پرسیار لێکردن،سوال و جوابکردن دەگەڵ کەسێ ( بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەیێك ) ، قسە لێ دەرکێشان. ★ (کعر.) ئیفادە وەرگرتن .

**ئیستینکاف کردن** ـ [ عا : استنکاف + کو : کردن ] ، ( مصت. لا. ١ـ بەعەیب زانینی کارێ . ٢ـ سەر کێشی کردن ، نەکردنی کارێك :: هەر ئیستینکاف دەکا قسەشی دەگەڵ بکا ، کەوابێ ئیستینکاف دەکەی ؟

**ئیستێناف** ـ [ = عا : دەست پێکردنەوە ، تێ هەڵچونەوە ] ، (نا.) ١ـ ( کئێر.) قۆناغی دوەمی دادگا ، دادگایەکە بۆ جاری دوەم تەماشای کێشەیەك دەکاکە دادگایەکی‌تر لە پێشدا حوکمی تێدا دابێ. ٢ـ (کعر.) قۆناغی پاش قۆناغی دادگای تەمێز .

**ئیستێناف کردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصت. مت.) ١ـ ( کئێر. ) داوای تەماشاکردنەوەی کێشەیەك کە لە پێشدا بڕیاری دادگای لە سەر دەرچوو بێ . ٢ـ ( کعر. ) داوای‌تەماشاکردنەوەی بڕیاری دادگای تەمێز لە سەر مەسەلەیەك .

**ئیسحال** ـ [محر. عا : اسهال]، (نمص) تە : ئیسهال .

**ئیسڕاحەت** ـ [ = عا : استراحة ] ، ( نمص. ) حەسانەوە ، ئاسودەیی :: ئەم منداڵە ئیسڕاحەتی لێ هەڵگرتوین شەو تا ڕۆژ هەر دەگری .

**ئیسڕاحەت کردن** ـ [عا. کو.] ، (مصت. لا.) ١ـ ماندوێتی دەرکردن ٢ـ ماندوێتی دەرچون . ٣ـ (مجە.) دڵنیابون ، خاترجەم بون ، دامرکان.

**ئیسڕار کردن** ـ [ عا : اصرار + کو. : کردن] ، (مصت. لا.) پێداگرتن سوربون لە سەر کارێ ، لە سەر (مەسەلەیێ) ڕۆیشتن .

**ئیسڕاف کردن** ـ [ عا : اسراف + کو : کردن] ، (مصت. لا.) ١ـ زۆر خەرج کردن ، بێ‌جێ خەرج‌کردن (پارە) . ٢ـ لە حەد تێپەڕاندن ،

زیادڕۆیشتن ( بۆکار و قسە )
٣ـ زۆر خواردن .
**ئیسفەند** ـ [ فر. ] ، ( نا. )
(کێر.) مانگی دوازدەهەمی ساڵی ئێرانی (ـ٢١ی شوبات ـ ٢١ ئازار)، ئاخر مانگی زستان . ★ ڕەشەمە
تێب ـ ئەم مانگە ٢٩ ڕۆژە و هەر بە چوار ساڵ جارێ دەبێتە سی ڕۆژ.
**ئیسقات** ـ [ = عا : اسقاط ] ، (نا.) خێراتێکە پاش مردنی کەسێك و پێش ناشتنی بۆی دەکرێ و بە دەستوری ئیسلامەتی جێگەی ئەم نوێژانە دەگرێتەوە کە کابرای مردوو بە زیندوی سەری خۆی نەیکردون و ئەو ( ڕۆژوو )انەی خواردونی . :: وەسێتی کردوە ئیسقات و تەلیلەی بۆ بکەن .
**ئیسقا (ێ)** ـ [ محر. عا : استسقاء ] ، (نا.) تە : ئاوبەند
□.« کێ بە کەدوی ئەو نۆشا ئاو
سەرد »
« نەوی جە ئیسقا وێنەی کەدوو
زەرد »
( خانا ـ ١٥١ )
:: ئەوە بۆ هێندە ئاو دەخواتەوە دەلەی ئیسقایی گرتوە .
**ئیسکارپێن** ـ [ ئیتالی ] ، (نا.) ، (سیە.) جۆرە کەوشێکی ژنانەیە لە دار دروست دەکرێ و تێزمالکە چەرمێکی لێدەدرێ کە سەر پەنجەی دەچێتە ناو . ★ پانی بەرز . تێب ـ ئەم وشەیە لە (سکارپێنا)ی ئیتالی وەرگیراوە بە مانای کەوشی پچوك یا جوانکێلە ، لە کاتی دەستەڵاتی عوسمانیدا لە ڕێگای زمانی تورکی‌را هاتۆتە ناو زمانی کوردی . □
«باڵابەرز و پچکۆلە پێ و ئیسکارپێن»
« گورەوی و پۆز سفت و سپی و
ئاورێشمێن »
(گۆران).
**ئیسکلێت** ـ [فرنسی] ، ( نا.) ، (کێر.) ١ـ هەمو ئێسقانی لەشی بنیادەم و گیاندارانی‌تر کە تێغەرەی پشتیان هەیە ( ئی بنیادەم ٢٠٨ پارچەیە) بەو شکڵەی تەبیعەت ڕێکی خستوە و تێکی‌خستونەوە ، هەیکەلی عەزمی . ٢ـ أ) شکڵ و قەوارەی خانوبەرە ، کە لەسەر ڕێ‌وشوێنی تازەی دروست‌کردن لە پێشدا پایە و کۆلەکەکانی هەڵدەستێنن . ب) هەیکەلی هەندی مەکینەی گەورە کە نیشان بدا لە پێشدا چۆن بوە یا لە پاشان چ شکڵی بە خۆیەوە دەگرێ . :: ئیسکلێتی چەند ئوتۆمبیلی سوتاو لەو دەشتە کەوتبون . ٣ـ ( مجـ.) ئادەمیزادی لەغەر و لاوازی ڕەق و تەقی بێ‌گۆشت . تێب ـ زمانی فرەنسی ئەم وشەیەی بە شکڵی ( ئێسکلێت ) لە ( سکێلێتۆس )ی یۆنانی‌ڕا کە مانای(ئیشك‌هەڵاتو)دەدا، خواستوتەوە ( تە : لارۆس ـ ٨٧٨) وفارسیش لە فرەنسی وەرگرتوە و لە سەرەتای ئەم چەرخەدا لە ڕێگای زمانی فارسییەوە هاتوتە ناو زمانی کوردی .
**ئیسلاح‌بون** ـ [عا : اصلاح + کو : بون ] ، (مصد.) ١ـ چاك‌بونی مەعنەوی . ٢ـ چاك‌بونەوەی شتێکی خراپ‌بوی .
**ئیسلاح‌کردن** ـ [ عا. کو. ] ،

( مصـت. مـت. ) ١ـ چـاك‌كردن ، چاك‌كردنه‌وه ( مه‌عنه‌وی‌وماددی ) . ٢ـ نه‌هێشتنی كه‌م و كوڕیی ( لـه ئینسـان یا له ده‌زگایه‌كی ئیداری و ....دا) ٣ـ لابردنـــی خراپـــی و شكاوی و له كاركه‌وته‌یی (له‌ماكینه و ....دا) ٤ـ ( مـجـ.) ، ( كـێـر. ) ڕێش‌تاشین، چـاك‌كردنی سـه‌ر لای سـه‌رتاش .

**ئیسلام** ـ [= عا : اسـلام ] ، (نا.)١ـدینێكی حه‌زره‌تی محه‌مه‌مه‌دی كوری عه‌بدوللای قوڕه‌یشی ( د.خ. لێبی ) پێغه‌مبـه‌رێتی ٢ـ ( مـجـ.) مسولمان .

**ئیسلام‌بوون** ـ [ عـا. كـو. ] ، (مصـت.لا.) قبـوڵ‌كردنی دینـی حه‌زره‌تی محه‌مه‌مه‌د ( د. خ. لێبی ). ★ مسـوڵمان‌بوون .

**ئیسـلامه‌تی** ـ [ ئیســلام + ئه‌تی ] ، [ عـا. كو. ] ، (حمصـ.) ئاكار و كرده‌وه و ڕه‌ووشتی دینـی ئیسلام به تێكڕایی .

**ئیسم** ـ [= عا : اسم ] ، (نا.) ١ـتم : ناو . ٢ـ تم : ئه‌فسوون/١ :: ئیسمێكی لێ‌خوێنـد كردی بـه به‌رد . **ئیسمی‌ئه‌عزه‌م** ـ [= عـا : الأسم الأعظم ] گـه‌وره‌ترین نـاو . تێبـ ـ له ناو ئه‌و ناوانـه‌ی كه خـوا هه‌یه‌تی ، یه‌كێكیانه ، وه‌كو ده‌ڵێـن هه‌ر كه‌س بیزانێ هیچ كارێكی لـه به‌ر عاسێ نابێ . **ئیسمی‌شه‌ریف** ـ ( كێر.) ڕسته‌یه‌كه پرسیاری نـاوی كه‌سـێكی پـێ‌ده‌كری ، له ئه‌سـڵا ( ئیسمی شه‌ریفتان چیـه ؟ )یه و كورت‌كراوه‌تـه‌وه ، به‌كارهێنـانی نیشانه‌ی ئـه‌ده‌ب و ئیحتیڕامـه . :: قوربان ئیسمی شه‌ریف (... تان چیه ؟ ) . **ئیسمی‌فـاعیل** ـ [عـا.] ناوێكه نیشان ده‌دا كه كه‌سێ كارێ ده‌كا یاحاڵێكی تایبه‌تی هـه‌یه . :: بكـوژ ، بڕ ، بخۆر ، خوێنـه‌ر ، جۆتیڕ . **ئیسمی مه‌صده‌ر** ـ [عا.] ووشه‌یه‌كه له فیعل داده‌تاشرێ و ده‌لاله‌ت‌له‌سه‌ر مه‌عنای مه‌صده‌ر ده‌كا ( نه‌مه‌صده‌رێشـه و نه‌ڕیشه‌ی فیعل) :: بڕشت ، تابوشت ، توانسـت ، خواست ، خوارشت ، خۆرشـت ، خارشت، زانست. **ئیسمی‌مه‌فعوول** ـ [ عا.] ناوێكه ، پێشانده‌دا كه‌سێك یا شتێك كاری‌تێكراوه (فیعلی واقیع بۆته سه‌ر) :: بڕاو ، بڕیاگ ، پالاوته، پا ڵێوراو، خه‌وتوو، نوستوو، كوژیاگ، مردگ ، مردوو . **به‌ئیسمی‌خودای** ـ شێوه ڕسته‌یه‌كه بۆ سوێند خواردن :: به ئیسمی خودای ئاگا و خه‌به‌رم لێ نیه .

**ئیسم‌وڕه‌سم** ـ [عا.] ، (نتـ.)، (كنـ.) ناو و شۆره‌ت ، ناوبـانگ ، ئاوازه . :: هێنده‌ی باس ده‌كـه‌ن ، كوا ؟ خـۆ چ ئیسـم و ڕه‌سـمێكی ئه‌وتۆی نیه .

**ئیسهال** ـ [= عا : اسهال ] ، (نا.) نه‌خۆشـــی زگ‌چـوون . ★ ئیسحال ، زگ‌چوون ، زگه‌شۆره ، زه‌حیری ، دیزه‌نتری .

**ئیسهال‌بوون** ـ [ عـا. كو. ] ، (مصت. لا.) تم : ئیسهال‌گرتن .

**ئیسهال‌گرتن** ـ [عـا. كو.] ، ( مصت. لا. ) تووشـی نه‌خۆشـی زگه‌شۆره‌بوون .

**ئیشاڕەت** ـ [ = عا : اشارة ] ، (نا.) کارێکە بێ قسەکردن مەبەستی پێ ئەدا'دەکرێ . □ «دەمێ تۆ نەینێی دەم وەبان دەم ، خـودا بێبـڕێ ئیشاڕەت وەچەم » . :: بە ئیشاڕە تێم گەیاند کە قسە نەکا .

**ئیشاڕە (ت) کردن** ـ [عا. کو.]، ( مصـ. لا. ) ١ـ بە دەست و چاو یا برۆ قسەدەگەڵ کەسێ کردن . ٢ـ دەربڕینی مەبەست بە بێ قسە کردن ٣ـ نیشان‌دانی کەسێ یا شتێ بە پەنجە لە دوورەوە ، پەنجە بۆڕاکێشان .

**ئیشاعە** ـ [ = عا : اشاعة ] ، (نا.) ، (کعر.) خەبەر یا قسەیەك (ڕاست یادرۆ) کە لە ناو خەڵکا بڵاو ببێتەوە و دەماودەم بڕوا . :: دوێنێ ئیشاعە وابوو دز کاروانەکەیان ڕووت‌کردوە . ★ (کئێر.) شایعە .

**ئیشالڵا** ـ [ = عا : انشاءالله ] ، ( رستە ) ئەگەر خوا بیەوێ ، ئەگەر خوا حەز کات . :: ئیشالڵا بەیانێ دەچمە شار ، ئیشالڵا کتێبەکەت بۆ هێناوم .

**ئیشتیباهـ** ـ [= عا : اشتباه] ، (نا.) . ١ـ (کئێر.) سەهو ، غەڵەت. :: میرزاڕەشید هەمێشە لە حیسابدا ئیشتیباهی هەیە. ٢ـ (کعر.) شك، گومان ، دوودڵی .

**ئیشتیبا (هـ) کردن** ـ ، [ عا. کو. ] ، (مصـ. لا.) ، ( کئێر. ) ١ـ لە حیسابدا سەهوکردن . ٢ ـ لەکاراندا بە هەڵەچوون .

**ئیشتیباهـ لێکردن** ـ [عا. کو.] ، ( مصـ. لا. ) ، ( کعر. ) ١ـ شك‌کردن لە کەسێ کە ڕەنگە کارێکی کردبێ :: ئیشتیباهی دزیان لێکردوە بۆیە گرتوویانە . ٢ـ شك لە نەخۆشییەك کردن کە تووشی کەسێك بووبێ . :: دوکتۆر دەیگوت ئازاد ئیشتیباهی سیلی لێدەکرێ .

**ئیشتیڕاك** ـ [ عا : اشتراك ] ١ـ (نا.) هاوبەشی ، بەشداری ٢ـ (نمصـ.) تە : ئیشتیڕاك‌کردن .

**ئیشتیڕاکات** ـ [ = عا. جمی : اشتراك] هەموو ئەو پارەیەی ئیدارەی ڕۆژنامەیەك لە کڕیارەکانی ، یا ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، لە خەڵکی سەربەخۆی وەری دەگرێ .

**ئیشتیڕاك‌کردن** ـ [ عا. کو. ]، (مصـ. لا.) ١ـ بەشداربوون لە کارێکدا ٢ـ کڕینی ڕۆژنامە و گۆڤار و ... بە ڕێك و پێکی ، ڕاستەوخۆ لە ئیدارەکەیان. ٣ـ بوونە ئەندام لە ڕێکخراوێکدا ، بەشداربوون لە کۆبوونەوەیەکدا .

**ئیشتیها** ـ [ = عا : اشتهاء ] ، (نا.) تە : ئیشتییا .

**ئیشتییا** ـ [محر. عا: اشتهاء] ، (نا.) ١ـ ئارەزووی خواردەمەنی ٢ـ مەیل ، ڕەغبەت .

**ئیشتییاکردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصـ. لا.) ئارەزووی خواردەمەنی و چێشتێکی تایبەتی کردن :: لە پاڵەوە دانیشتوە و وردە ئیشتییایان دەکا ، لە ئەورووپا پیاو ئیشتییای قبووڵی دەکا .

**ئیشتییالێبوون** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصـ. لا.) ١ـ زۆر حەز لە

خواردنێکی معیێن کردن . :: هەتا
دەچمە ماڵی نەوزاد دۆڵمەیان هەیە ،
دیارە زۆری ئیشـتیبا لیێـەتێ .
٢ــ مەیل بە کردنی کارێ یا دەگەڵ
شتێ :: ئەوە چیە هێندەت ئیشتیبا
لە قسانە ، سەربەست ئیشتیبای
لە سەفەران نیە .

**ئیشتیبانەبردن** ــ [عا. کو.] ،
(مصد. لا.) ١ــ حەز لـە خواردنی
خواردەمەنێکی معیێن نەکردن . ::
خەڵـکی شار ئیشـتیبایان چەنگ
سۆتەکە و ئەو جۆرە چێشتانە نابا .
٢ــ (کن.) تێرخواردن لە چێشتێك ،
کەم خواردن و ئارەزۆ بەسەرچۆن لە
خواردەمەنیەك ، حـەز بە خواردن
نەکردن . :: وەرە بـە زیادێ کـە
ئیشتیبام نابا .

**ئیشغاڵ‌کردن** ــ [ عا : اشغال +
کو : کردن ]، ( مصد. متە. ) (کئێر.)
١ــ خـەریك‌کردنی کەسـێ ،
لەکارکردنێ :: پیـاوی چـاك بـە
ئیشغاڵمان مـەکە کارمان هـەیە .
٢ــ داگیرکردنی شارێ یا وڵاتێ یا
جێگایەك بـە زەبری لەشـکر . ::
هیتلەر هەمۆ ئەورۆپـای ئیشغـاڵ
کرد . ★ ( کعـر. ) ئیحتیـلال .
٣ــ ( کعر. ) پڕکردنەوەی شوێنێك
(بە دانیشـتن یا وەزیفە) :: خۆیەتی و
لینگی ژنی ئەو خانوە زلەی ئیشغاڵ
کردوە . چەند وەزیفە هەبۆ تا خۆم
گەیاندێ هەمۆی ئیشغاڵ کرابۆ .

**ئیشك** ــ [ ست : هوشکە ، پە.
هوشك ] ، ( صە. ) ١ــ شـتێك یا
جێگایەك ئاوی نەبێ ، شەی نەبێ ،
نمی نەبێ. :: کانێ ئیشك، دەشتی
ئیشك، تفی لە زارێدا ئیشك بۆ. ٢ــ
حاڵی شتێکی لە پێشدا تەڕایێ تێدا
بۆبێ، پاشان نەی مابێ. :: گیای
ئیشك،داری ئیشك،هەنجیری ئیشك
□«دارێکی بە تەڕێ دانەیە بە ئیشکی
دانایێ» ٣ــ (مج.) ئینسانی لاسار و
دۆر لە مجامەلە . :: پیاوی هێندە
ئیشك هەر نابێتەوە . ٤ــ ( مج .)
دانیشـتنی دۆسـت و برادەر بە بـێ
خواردنەوە . :: هەروا بە ئیشـکی
دانیشـتن ناخۆشە با پێکێ بخۆینەوە.
٥ــ (مجــ.) بێ‌پێخـۆر . :: نـانی
ئیشکی،سێ نانی بە ئیشکێ خوارد و
چوارێش بە دۆوە . ★ ووشـك ،
ویشـك ، هیشـك .

**ئیشکارۆ** ــ [ ئیشك + ئـارۆ
( ؟ ) ] ، (نتــ.) ، (مک.) مەڵبـەندی
بێ ئاو و گییا. تێبـ : بۆ کەرتی دوەمی
ئەم ووشـەیە ( ئارۆ ) هس : ئاران .

**ئیشکال** ــ [= عا : اشـکال ] ،
( نمصــ.) ، (کئێـر.) دژوارێ ،
ئاڵۆزێ، ناڕەحەتێ.:: زۆری ئیشکال
تێدایـە ، ئیشـکالێکی گەورەیـە ،
ئیشکالی تێ خـستوە . ★ (کعر.)
موشکیلە .

**ئیشـکالتراش** ــ [ ئیشـکال +
تـراش ] ، [ عا. کو. ] ، ( نفـا.) ،
(کئێر.) ئەو کەسەی کاران وەگران
دەخا ، ئەوەی کۆسپ دێنێتە بـەر
کاران . :: ئیشکالتراشی وەك خدری
هەر نابێتەوە .

**ئیشکاڵتراشی** ــ [ئیشکالتراش
+ ٢ــ ئێ ] ، [عا. کو.] ، (حمصـ.)،
(کئێر.) کۆسپ هێنانە سەر ڕێـی
جێ‌بەجێ‌بۆنـی کـاران ، تـەگەرە

تێخســـــتن . :: ئەوەنـــــدەی ئیشکال‌تراشێ کرد یەکجارێ وازم لە کارەکە هێنا .

**ئیشکانێ ــ** [ ئیشك + ئانی/٢]، (نـ.) ١ــ هەر شوێنێکی ئیشك کـە دەور و بەری قوڕ و چلپاو بێ . :: ڕۆلـە بە ئیشـــکانییەکەدا بـڕۆ بـا کەوشەکانت قـوڕاوێ نەبـن . ★ ئیشکایێ . ٢ــ جێگا ووشکەکانــێ سەر زەوێ // دەریا :: پاش حەوت ڕۆژان ئیشـــکانێ دەرکـەوت . ٣ــ [ ئیشك + ئانی/١ ] ، ( صـ.) ئەو حالەی پاش تەواوبونی تەڕ ۆ قوڕی زستان بە سەر زەویدا دێ . :: لە باران بڕانەوە ئیتر ئیشکانێ دەست پێدەکا .

**ئیشکاو ــ** [ ئیشك + ١ــ ئاو ] ، ( نـ.) ، ( مجـ.) دوایێ کاران یا شتێ

**ئیشکاووز ــ** [ئیشك+١ــ ئاو+ وەز ] ( صـ.) ، ( هلـ.) دەغلێکـی پێش بارانی پەلە چاندرابێ . تێبـ ــ کەرتی سێیەمی ئەم ووشەیە بە لای منـــەوە (وەرز)ەکـە یەکێـك لـــە مەعنـــاکانی بە زمـــانی پەهلـەوێ (چاندن)ە (تم: فرە، پفاـ٤٥٤) و هەر ووشـەی (وەرز)ی ئیستای خۆمانـە کە بە مانـای ( حـول )ی عەڕەبـی بەکاردێت .

**ئیشکاوهاتن ــ** ( مصـــ. لا. ) ١ــ بڕانەوە و جارێ‌نەبونی ئاو بـە جۆگەدا . ٢ــ ( مجـ.) دوایێ‌هاتن ، بڕانەوە و تەواوبونی هەر شتێکی تر ☐ « وەکو کەو لە فڕە چو ، دارم ، لە گونجێ »

«قسـەی ڕاکرد و هات ئیشـکاوی دەنگێ »

ر ( هەژار )

**ئیشکایێ ــ** [ ئیشك + ئایی/١]، ( نـ.) تم : ئیشکانی/١ .

**ئیشك‌بون ــ** ( مصـ. لا. ) ١ــ بڕان و بڕانەوەی ئـاوی ڕۆبـار و کانیاوان :: هەمو سالێ لەم مانگەدا کانێ ( پێرمەلەك )ئیشك دەبێ . ٢ــ نەمانی نم و شەی‌تەبیعی لە شتێکدا :: بڕانە ! تۆتنەکە ئیشك بوە ؟ داری شەخسەکانی سێتەك هەمو ئیشـــك بون کەس نەی‌دەوێرا دەستیان بۆ بەرێ . ٣ــ مردنی گیاو گوڵ و دار و درەخت و کشتوکاڵ لەبەر بێ ئاوێ یا هەر هۆیەکی‌تر :: ئـەم بێســتانە بۆچێ ئیشك بوە ؟ پەلـــە تۆننەکەی کوێخا تۆفیق ئیشك‌بوە . ٤ــ (مجـ.) لە جوڵەکەوتن :: کابرا وەها حەپەسا هەر لە جێی خۆی ئیشك بۆ .

**ئیشك‌بونـەوە ــ** ( مصـ. لا. ) ١ــ نەمانی شوێنەواری تەڕی لە هەر شتێکا کە خۆی لە ئەسـلا تەڕایـێ نەبێ و لە لاوە تەڕبوبێ ( شـۆرابێ ، ئاو یا شـتێکی دیکەی پێدارژابێ ، کەوتبێتە ئاوەوە . . . ) :: کراسەکەت بەرە هەلێخە هەر ئێســتا ئیشـــك دەبێتەوە . ٢ــ پەیدابونی ئیشکانی لە سەر زەوێ :: دنیا هەموێ ئیشك بوتەوە کەچێ ئەم دێبـەرەی ئێمـە هەروەکو خۆیەتێ .

**ئیشك‌کردن ــ** ١ــ (مصـ. متـ.)، أ ) نەهێشتنی تەڕایێ لە شتێکدا کە خۆی تەڕایێ هەبێ ، بە هەر هۆیەکی لەلاوە. :: لە کوردستان گەلێ میوە و

گیا و گۆڵ ئیشك دەکەن و هەڵیدەگرن بۆ زستانێ . ب) بە کارێکی مەعنەوێ (بەدقەدەمێ ، چاوپیسێ ، بێشانسێ ...) خێر لە کارێك یا شتێك بڕین ، کەلك پێوە نەهێشتن □ « بچێتە سەر ستێروان ئیشکی دەکا » . ٢ـ (مصت. لا.) ، أ ) تم : ئیشکبۆن/١ :: هەمۆ ساڵێ لەم مانگەیدا کانی پیرمەلەك ئیشك ( ئیشکی ) دەکا . ب ) بڕانی شیری مەڕ و بزن و مانگا و ... :: مانگاکەی ماڵی حاجێ شەرێف ئیشکی کردوە .

**ئیشککردنەوە** ـ ( مصت. مت.) نەهێشتنی تەڕایێ لە سەر شتێکی کە لە لاوە تەڕکرابێ یا تەڕ بۆبێ . :: دە وەرنە نێزێك سۆبەکە خۆتان ئیشك کەنەوە ، ها ! ئەوە خاولێ دەم و چاوتێ پێ ئیشککەوە . ٢ـ ( کنـ. ) پاشەکەوتکردن ، دەستپێوەگرتن ، لەچەرێکردن. :: بە قوربانە ! لیرەکان دەست لێ مەدە هەر ئیشکیان کەوە . هێچ خەرج ناکا هەر خەرێکە پارەکانی ئیشك دەکاتەوە، ئەم منداڵانەی لە برسان ئیشککردۆتەوە. تێبـ ـ بە کارهێنانی ئەم ووشەیە بەم مانایانە، سەرکۆنەی تێدایە .

**ئیشك و برینگ** ـ [ ؟ ] ، (صت.) هەر شتێکی هێچ تەڕایێ تێدا نەبێ . :: کچێ بڕۆ هەی مەکرباز ! قوڕی چی ؟ دنیا ئیشك و برینگە .

**ئیشکە** ـ [ئیشك + ە ـ ئە/٢]، (صت.) ١ـ مەڕ و بزن یا مانگا یەکێ نەزابێ . ٢ـ پارەیێکی لە لاوە داندرابێ و نەخرێتە سەوداوە . :: دە هەزار دینار پارەی ئیشکەی لە ماڵێ هەیە .

**ئیشکەدۆ** ـ [ ئیشکە + دۆ ] ، (صت.) ، (کیـ.) حەیوانێکی نەزابێ و شیری هەبێ

**ئیشکەڕن** ـ [ ئیشك + ٣ـ ئە/٢ + ڕن ( ڕنینەوە ) ] ، ( نت. ) ١ـ کاری ڕنینەوەی خورێ و مۆی کەولێ مەڕ و بزن کە بە زیندۆیێ نەبڕابنەوە . ٢ـ (مک.)یەکێکە لە عناصری یارێ ( میرمیرێن ) کە تا بیست سێ ساڵ لە مەوپێش لە کوردەوارێدا باو بۆ. تێبـ ـ ئیشکەڕن زەلامێك بۆ جلکی سەیری دە بەردەکرا ، ڕێشێکی گەورەیان لە خورێ بۆ دەکرد ، کۆلەکە ئاویەکی درێژۆکەشی لە باتێ کڵاو دەکردە سەر و گۆپالێکی گەورەی بە دەستەوە دەگرت ، ئەم پیاوە دۆ ئیشی هەبۆ ، یەکیان جێبەجێکردنی هەمۆ فەرمانێکی میر ، دوەمیان وەپێکەنین خستنی میر تا بەپێی ڕێ و شوێنی یاریەکە لە میرێتێ بکەوێ .

**١ـ ئیشکەڕۆ** ـ [ ئیشکە + ڕۆ ( ڕۆیین ) ] ، ( صت. ) وولاغی بەرزە کە خێرا نەڕوا ، گران بڕوا و دەست و قاچی خراپ باوێژێ . // خۆشڕۆ .

**٢ـ ئیشکەڕۆ** ـ [ ئیشکە + ڕۆ = ڕۆبار ] ، ( صت.) حالی ڕۆبارێکی هەندێ وەخت ئاوی پێدادێ و کاتێکیش وشکێ دەکا .

**ئیشکەسۆفێ** ـ [ ئیشك + ٣ـ

ئه/١ + سۆفیٚ] ،(نت.) ١ــ سۆفیێکی زۆر بە تەنگ جیٚبەجیٚکردنی داب و دەستوری سۆفیاتیەوە بیٚ ، سۆفیٚ متعصب ☐ « زەمزەمەی بولبولی بەهارانی ، ئیشکەسۆفیٚ دەخاتە گۆرانیٚ » (؟) ٢ــ کەسێکی وا پێشان دەدا کە سۆفییە و ئاکارێشی سۆفیانە نەبیٚ . تێبـ ــ بەم مانایە وەکو لاتاو بەکاردێت .

**ئیشکەسەرما** ــ [ ئیشک + ٣ــ ئه/١ + سەرما ] ، ( نت. ) سەرمایەکی بەفر یا بارانی دەگەڵ نەبیٚ . :: ئیشکە سەرمای کەرکوك لە مۆخی ئێسقان کاردەکا .

**ئیشکەکەڵەك** ــ [ ئیشك + ٣ــ ئه/ + کەڵەك ] ، (نت.) دیٚواری بەرد ، کە بەردەکان چیٚن‌چیٚن لە سەریەك داندرابن بیٚ ئەوەی قوڕیان لە بەیندا بیٚ . :: بەردەمی ئەشکەوتەکەی (خلەگەر)مان بەئیشکە کەڵەك هەڵچنیٚ .

**ئیشکەڵ** ــ [ ئیشك + ئەڵ/٢]، (نت.) لق و پۆپی ئیشكبۆی دار و درەخت .

**ئیشکەڵوا** ــ [ ئیشك + ٣ــ ئه/١ + هەڵوا ] ، (نت.) هەڵوای ئیشك : تێبـ ــ خواردنێکە لە ئاردوڕۆن و دۆشاو یا شیٚرەی شەکر ساز دەکریٚ ، زیاتر بۆ سەفەری دوٚر ( حەج و . . . ) دەگەڵ خۆیان دەبرد .

**ئیشکەمس** ــ [ ئیشك + ٣ــ ئه/ + مس = مز ] ، ١ــ ( نت. ) مۆچەی کرێکار کە نان‌خواردنی دەگەڵ نەبیٚ ( زیاتر مەبەست نانی نیٚوە ڕۆیانە ) ، ٢ــ ( صت . ) ، أ) کرێکارێکی بە ڕۆژانەی ڕۆت کار دەکا و نان لە سەر حیسابی خاوەن‌کار ناخوا . ب) کارێکی بەم شیٚوەیە بکریٚ :: بە ئیشکەمس ئەو پەڵە دەغڵە بدروٚنەوە، ئیشکەمس ئەو دیٚوارەمان بە چەند بۆ دادەنیٚن ، کاری ئیشکەمس هەروا دەبیٚ .

**ئیشكهەڵاتن** ــ [ ئیشك + هەڵ + هاتن ] ، ( مصت. لا.) ، ١ ــ ڕەق‌بوٚن و شکڵ تیٚکچوٚنی هەندیٚ شت ( پێست ، نان ، کەشك ، . . . ) ٢ــ ( کن. ) ڕەق و تەق و بارێك‌بوٚنی گیاندار ( بە تایبەتیٚ ئینسان ) لەبەر نەخۆشیٚ یا برسێتیٚ و نەخواردن .

**ئیشك هەڵێنان** ــ [ ئیشك + هەڵ + هێنان ] ، ( مصت. مت. ) ، (کن.) برسیٚ‌کردن و گرتنەوەی خواردن لە کەسیٚ یا کەسانیٚ و بوٚنە مایەی نەخۆشییان :: ئەو منداڵانەی ئیشكهەڵێناوە هێچیان ناداتیٚ بخۆن،هێندەی نان و دۆ دەرخوارددا تا بە جارێك ئیشکی هەڵێنا .

**ئیشکێل** ــ (نا.) ، ١ــ (مکـ.) پارچە تەختەیەکی شیٚوە سیٚ سوٚچیٚ درێژۆکەیە ، بە تاقە بزمارێك لە لای سەر و خواری پەنجەرە دادەکوترا بۆ ئەوەی نەهێڵیٚ بکرێتەوە . ★ شەیتانۆکە ٢ــ ( سن. ) پیٚوەند یا هەر شتێکی‌تر کە دەست و قاچی وولاغی بەرزەی پیٚ دەبەستنەوە . ٣ــ ( مجـ. ) ، ( سن. ) فەرمان ، حوکم ، دەستەڵات .

**ئیشکێل‌کردن** ـ ( مصتە. متە. )، (سنە.) ، ١ـ پاشبەند و پێشبەند کردنی وولاغی بەرزە :: بەم گورێسە ماینەکە ئیشکێل کە با ڕانەکا . ٢ـ بەستنەوەی دەستێك و قاچێکی وولاغ بۆ هەر مەبەستێ بێ .

**ئیعادەکردنەوە** ـ [عا : اعادة + کو : کردنەوە ] ، ١ـ ( مصتە. لا. ) دۆپاتەکردنەوەی قسە ، سەرلەنوێ خوێندنەوە یا گوتنەوە . :: چەند جارمان لێ ئیعادەکردەوە ، ئەوجار تێ‌نەگەیشت . زۆر سەیرە دەجار قسەیەك ئیعادە دەکاتەوە . ٢ـ (مصتە. متە.) ، أ) ڕەت کردنەوەی شتێك بۆ خاوەنی . :: کتێبەکەم بۆ ئیعادەکردەوە ، هێشتا پارەکەی شێرکۆی ئیعادە نەکردۆتەوە . ب) گەڕاندنەوە و ناردنەوەی شتێك بۆ شوێنێ . :: ئەوڕاقەکانیان ئیعادەی بەغدا کردۆتەوە .

**ئیعاشە** ـ [ = عا : اعاشة = ژیاندن ] ، ١ـ ژیان ، گوزەران :: ئیعاشەی بە چییە ؟ ★ مەعیشەت. ٢ـ ( کعر. ) دایرەیێکی حکومەتییە بە کاروباری ئازۆقە ڕادەگا (مدیریة الأعاشة العامة ) . :: نانی ئیعاشە بە پێنج فلسانە .

**ئیعانە** ـ [ عا : اعانة = یارمەتێ دان ] ، ١ـ (نمصە. ) یارمەتێ دان ، کۆمەگ کردن . ٢ـ (نا.) پیتاك .

**ئیعانەکۆکردنەوە** ـ [ ئیعانە/٢ + کۆ + کردنەوە ] ، [ عا. کو.] ، ( مصتە. متە. ) خڕکردنەوەی پارە یا هەر شتێکی دیکە لە خەڵك ، بۆ یارمەتیدانی کەسێك یا هەیئەتێکی کۆمەڵایەتێ یا بۆ کاری خێر . :: مزگەوتەکە ڕۆخابۆ ئەهلی گەڕەك ئیعانەیان کۆکردەوە و چاکیان کردەوە .

**ئیعتبار** ـ [= عا : اعتبار ] ، (نا.) ١ـ نرخ ، بایەخ :: قسەی ئەم پیاوە ئیعتیباری بۆ نیە . ئەوەندەیان درۆ کردوە قسەیان ئیعتیباری نەماوە . ٢ـ باوەڕێ ، بڕوا ، بە حیساب هاتن . :: ئیعتیباری پێ مەکەن . پیاوی هەڵمەتەکاسە بە هیچ ئیعتیبار ناکرێ. ٣ـ ( کئێر.) ، أ ) ئەو باوەڕەی بازرگان یا بانك بە کەسێکی دەکا و پارە یا کاڵای بە قەرز دەداتێ :: ئیعتیباری ملیۆنێکی لە بازاڕ هەیە. بانك ئیعتیبارێکی صەت هەزار تمەنێ بۆ کردۆتەوە . ★ ( کعر.) ئیعتیماد . ب) میقدارێك پارەیە لە بۆدجەی دەولەتێدا بۆ مەبەستێك تەرخان دەکرێ . :: ئیعتیباری سۆتەمەنێ مەدرەسەکانی مەهابات ساڵێ ٢٥٠ تمەن بۆ . **بە ئیعتیباری...** ( کعر.) لەبەر ئەوەی ..، بەو حیسابەی کە ... :: بە ئیعتیباری ئەوەی ئێوە لە کۆنگرەکە بۆن باش دەزانن بڕیارەکانی چن . **لە ئیعتیباری ... وە** ـ ( کعر.) لە ... وە بەدواوە . :: لە ئیعتیباری ئەم سەعاتەوە ئیتر من قسە لەم مەسەلەیە ناکەم .

**ئیعتیبارپێ‌کردن** ـ [عا. کو. ] ، ( مصتە. لا.) ، ( کئێر.) باوەڕکردن بە کەسێ لە هەر بابەتێکەوە بێ .

**ئیعتیبارکردن** ـ [ عا. کو. ] ،

( مصد. لا.) ، (كعر.) به حیساب هێنان ، له قه‌ڵه‌مدان . :: ئیعتیباری‌كه‌ن من هه‌ر نه‌بوم، وای ئیعتیباركه پیاوێكی كوشتوه و خۆی هاوێشتۆته ماڵت .

**ئیعتیبارنامه** ــ [ عا. كو. ] ، ( نه‌.) ، ( كێر.) ١ــ كاغه‌زێكه تێیدا ده‌نوسرێ كه كه‌سێ بۆ نوێنه‌رایه‌تی په‌رله‌مان یا كۆنگره‌ی پارتێكی سیاسی هه‌ڵبژێردراوه و ئه‌ندامانی ئه‌نجومه‌نی هه‌ڵبژاردن ئیمزای ده‌كه‌ن . ٢ــ نامه‌یه‌كه بالیۆزی ده‌وڵه‌تێك له سه‌رۆكی ده‌وڵه‌تی خۆیه‌وه بۆ سه‌رۆكی ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ی ده‌با كه له ولاته‌كه‌یدا بۆته بالیۆز و به پێی ڕێ و شوێنێكی تایبه‌تی ته‌سلیمی ده‌كا . ( عا.) ئه‌وڕاقی ئیعتیماد .

**ئیعتیراز** ــ [= عا : اعتراض ] ، ( نمص.) ڕازی‌نه‌بون به كاری یا قسه و كرده‌وه‌یێك . :: ئیعتیرازم هه‌یه . هیچ ئیعتیرازێكی نه‌بو . ئیعتیرازی پێشان نه‌دا .

**ئیعتیرازكردن** ــ [ عا. كو. ] ، ( مصد. لا.) ده‌ربڕینی ناڕازێتی به‌رامبه‌ر كار و قسه‌ی كه‌سێ یا هه‌یئه‌تێ. :: ئه‌و هه‌مو ئیعتیرازه‌شی كرد گوێیان نه‌دایه .

**ئیعتیرازگرتن** ــ [ عا. كو.] ، ( مصد. مت.) ده‌رباره‌ی كار و كرده‌وه ، یا قسه و بڕیار ، له كه‌سێ یا هه‌یئه‌تێ وه‌ده‌نگ‌هاتن . لێڕاست بونه‌وه و پێشاندانی ناڕه‌زایی . قبوڵنه‌كردنی بڕیار .

**ئیعتیراف** ــ [= عا : اعتراف ]، ( نمص.) ئیقرار ، دان به شتێكدانان. :: به ئیعتیرافی خۆی په‌نجا دینار قه‌رزداره .

**ئیعتیراف‌پێكردن** ــ [ عا. كو.]، ( مصد. مت.) ١ــ به‌ڕاست زانین ٢ــ به‌ره‌سمی‌ناسینی ده‌وڵه‌ت یا هه‌ر هه‌یئه‌تێكی كۆمه‌ڵایه‌تی ، سیاسی و ... ٣ــ به زۆر و زه‌بری لێدان یا هه‌ر هۆیه‌كی دیكه ڕاستی كاری یا ڕوداوی به كه‌سێ ئاشكراكردن .

**ئیعتیرافكردن** ــ [ عا. كو. ] ، ( مصد. لا.) ١ــ ئیقراركردن دان‌پێداهێنان . ٢ــ ڕاستی‌گوتن ، سه‌لماندن . ٣ــ ئاشكراكردنی ئه‌ندامه‌تی خۆ و خه‌ڵك له پارتییه‌كدا لای كاربه‌ده‌ستانی مێری یا ده‌رخستنی نهێنییه‌كانی ئه‌و پارتییه.

**ئیعتیساب** ــ [= عا : اعتصاب]، ( نمص.) ، ( كێر.) ته : ئیزڕاب .

**ئیعتیقاد** ــ [= عا : اعتقاد ] ، (نا.) باوه‌ڕ :: ئیعتیقادت پێ درۆت ده‌گه‌ڵ ناكه‌م . به ئیعتیقادی من ئه‌م ئێشه‌نابێ وا بێ . ★ ئاقیده ، ئیتقات .

**ئیعتیماد** [= عا : اعتماد ] ، ( نمص.) پشت‌پێ‌به‌ستن ، ئه‌مین‌بون دڵنیایی . :: زۆری ئیعتیماد له سه‌رده‌كرد . نازانم چۆن ئیعتیمادی پێده‌كه‌ی ، ئیعتیمادێكی زۆری پێ هه‌بو . جێگای ئیعتیماده .

**ئیعتیناپێكردن** ــ [ عا : اعتناء + كو : پێكردن ] ، ( مصد. مت.) ١ــ گوێ‌پێدان ، ئه‌همیه‌ت‌پێدان . ٢ــ ئاوڕلێدانه‌وه . :: ئیعتینا به‌م جۆره شتانه ناكا . هه‌ر ئیعتیناشی

پێ نەکرد . دەبێ ئیعتینای پێبکەی.

**ئیعدام** ـ [= عا : اعدام] ، ( نمصـ.) تـە : ئیعدامکردن . :: حوکمی ئیعدامی دراوە . حوکمیان دابـو بـە ئیعـدام تەمێـز هەڵیوەشاندەوە . □ « ئیعدامم بۆ سادیر بێ ، دەم لە خاڵ ناگوێزمەوە » ( فولکلۆر ) .

**ئیعدامکردن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصـتـ. متـ.) کوشتنی کەسێ لەسەر بڕیاری دادگایەك ، جا بە هەڵاوەسێن بێ یا گوللەبارانکردن و ...

**ئیعلان** ـ [= عا : اعلان ] ، (نا.) دەنگ و باسێکی کەسێك یا دایرەیێك لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەدا یا لەسەر کاغەزێکی جیا ، دەربارەی شتێك یا کارێك بڵاوی دەکاتەوە .

**ئیغڕاق** ـ [= عا : اغراق ] ، (نا.) ١ـ زیادڕێوەنان ، موبالەغە ٢ـ فێشال ، قسەیێکی زیاتر لە درۆ بچێ تا ڕاست .

**١ـ ئیفادە** ـ [ ؟ ] ، (نا.) ، ( مک.) فێز ، دەعیە . تەکەببور

**٢ـ ئیفادە** ـ [= عا : افادة ] ، (نا.) ، (کعر.) هەمو ئەو وەڵامانەی کەسێك دەربارەی مەسەلەیێك لە سوال و جوابێکی ڕەسمێدا دەیانداتەوە .

**ئیفادەدان** ـ [٢ـ ئیفادە + دان]، [عا. کو.] ، (مصـتـ. لا.) ، ( کعر.) قسەکردنی کەسێك بۆ یەکێکی ڕەسمێ کە لە مەسەلەیەك دەکۆڵێتەوە .

**ئیفادەلێدان** ـ [ ١ـ ئیفادە + لێدان ] ، (مصـتـ. لا.) ، (مک.) ناز و فێز کردن بە سەر خەڵکا . □ « بای دەدا ، بای دەدا ، نێو تۆنەکەی بادەدا + هێشتا نەبوە بە حاکم ، ئیفادە چۆن لێدەدا » ( فۆلکلۆر ) ★ پۆزلێدان .

**ئیفادەوەرگرتن** ـ [ ٢ـ ئیفادە + وەرگرتن ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصـتـ. متـ. ) ، ( کعر.) پرسیارکردن و قسەدەرکێشانی یەکێکی ڕەسمێ ( محقق ) لە کابرایەك دەربارەی مەسەلەیەك . ★ ( کێـر. ) ئیستینتاقکردن ، بازجۆیێ .

**ئیفاقە** ـ [= عا : افاقة ] ، ( نمصـ.) چاكبونەوە لە نەخۆشێ . :: ئیفاقەی هاتوە . ئیفاقەی بۆ .

**ئیفتادە** ـ [= فر : ئوفتادە ] ، ( نمفـ. صمفـ.) پێر ، لەکارکەوتـو ، پەككەوتە . :: پێرێکی ئیفتادەی حەفتا هەشتا ساڵێ لەوێ بو . □ « ... خۆیکردە سۆفێکی ئیفتادە ، دەشـاری مەدێنەی گەڕاوە » ( تحفە : ج ٢ ـ ٢٢٣ ) .

**ئیفتار** ـ [= عا : افطار ] ، (نا.) وەختی شەرعێ ڕۆژۆشکاندن :: هێشتا ئیفتار نەبوە چۆن ئاو دەخۆیەوە ؟. بۆ ئیفتارێ بانگهێشتنی کردبۆین ★ بەربانگ . ( با.) فتارە.

**ئیفتارکردنەوە** ـ [ عا. کو.] ، ( مصـتـ. لا.) ڕۆژۆشکاندن . بەربانگکردنەوە .

**ئیفتیخار** ـ [= عا : افتخار ] ، (نا.) شانازێ . سەربەرزێ . :: صلاح‌الدین مایەی ئیفتیخاری کوردانە .

**ئیفتیخارپێکردن** ـ [ عا. کو. ]،

( مصت. لا.) شانازی بە کەسێ یا بە شتێك کردن . :: ئیفتیخاری پێدەکەم کە تێکۆشەرێکی کوردە . ★ ئیفتیخار پێوەکردن . شانازی پێوەکردن .

**ئیفتیخارپێوەکردن** ـ [عا. کو.]، ( مصت. لا.) تە : ئیفتیخارپێکردن .

**ئیفتیخارکردن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) شانازیکردن . بەخۆ فشین .

**ئیفتیرا** ـ [= عا : افتراء ] ، (نا.) تە : بوختان . :: ئەم قسەیە ئیفتیرایە .

**ئیفتیراپێکردن** ـ [عا. کو.] ، ( مصت. مت.) تە : بوختانپێکردن :: ئیفتیرایانپێکرد .

**ئیفتیزاح** ـ [= عا : افتضاح ] ، ( نا.) ، ( کئێر.) ڕیسوایی . بێئابڕوویی . بەدناوی . :: عەجەب ئیفتیزاحێکە . ئیفتیزاحێکی ناوەتەوە نەبێتەوە .

**ئیفلاس** ـ [= عا : افلاس ] ، ( نمصـ.) ، ( کمر.) نەداری ، نابوتی .

**ئیفلاسکردن** ـ [ عا. کو.] ، ( مصت. لا.) ، ( کمر.) ١ ـ نابوتبونی بازرگان یاکاسبێکی ناوبازار . نەداربون . لە مایەکەوتن ٢ـ دۆڕاندنی زۆر لە قومارا . ٣ـ لەدەستدانی باوەڕی خەڵك بەخۆ ، لە ئیش و کاری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا .

**ئیفلیج** ـ [ عا.] ، ( صـ.) حاڵی کەسێکی هەمو لەشی یا لایەکی یا هەندێ جێگای لە کارکەوتبێ و نەجوڵێ . □« لە خوام تەڵەبە ڕۆڵە گۆج و ئیفلیج بی » .

**ئیفلیجبون** ـ [ عا. کو.] ، ( مصت. لا. ) لەکارکەوتنی لایەك یا هەمو لەش یا بەعزێ ئەندامی کەسێك . ★ شەپلەلێدان .

**ئیفلیجی** ـ ( نا.) ، ( کئێر.) نەخۆشی شەپلە . تێب ـ کەسێ ئەم نەخۆشییەی گرت ئیرادەی لەسەر دەمارەکانی لەشی کەم دەبێتەوە یا هەر بە جارێك لە دەستی دەردەچێ بە جورێ کە ناتوانێ بە ئارەزوی خۆی هەندێك ئەندامی ( دەست ، لاق ، ...) خۆی بجوڵێنێ یا ڕایانوەستێنێ و بێ ئەوەی حەزی لێبێ لە خۆیانەوە دەلەرزن . :: تۆشی ئیفلیجی بوە ، تۆشی ئیفلیجیهاتوە . ★ ( کمر.) شەلەل.

**ئیقامە** ـ [ = عا : اقامة ] ، ١ـ ( نمصـ.) ، ( کمر.) نیشتەجێبونی خەڵکی وڵاتێك لە وڵاتێکیتر بە ئیجازەی حکومەتی ئەم وڵاتە و بە پێی ڕێ و شوێنی تایبەتی . :: بە ئیقامە لە عێڕاق دانیشتوە . ★ (کئێر) ئیقامەت. ٢ـ (نا.) بەڵگەیێکی ڕەسمییە دەدرێ بەو کەسانەی کە لە وڵاتێکی ترا نیشتەجێ دەبن . :: ئیقامەکەیان بۆ تازە نەکردەوە و دەریانکرد . ٣ـ (نا.) دایرەیێکی ڕەسمییە لە هەمو دەوڵەتێکا ، بە ئیش و کاری هاتوچۆ و دانیشتنی خەڵکی بێگانە ڕادەگا . **ئیقامەی دەعوا کردن** ـ شکایەت بردنەبەر دادگا بە شێوەیێکی قانونی .

**ئیقامەت** ـ [ عا. ] . ( نمصـ. و نا.) ، (کئێر.) تە : ئیقامە .

**ئیقبال** ــ [ عا : اقبال = زۆتێکردن ] ، (نا.) بەخت ، تاڵع :: چبکەم ئیقباڵێ منیش ئاوایە . □ « هەمۆ شتێك بە ئیقباڵە » .

**ئیقتیدار** ــ [ = عا: اقتدار ] ، (نمص.) توانایێ ، دەستەڵات :: ئەوەند زۆت و زەجاڵە ئیقتیداری نانی شەوی نیە .

□ « حسب الأمر شای گەردۆن ئیقتیدار »
« نەقیبان بەزم خەرگەی زەڕنیگار »

**ئیقتیصاد** ــ [ = عا : اقتصاد] ، ( نا. ) زانستێکی کۆمەڵایەتییە دەربارەی هەمۆ ئەو چالاکیانە دەدوێ کە پێوەندیان بە داهات و خەرجی ئەفرادەوە هەیە و باسی چۆنێتی پێوەندێ ماڵێ ئەوان دەکا کە لەناو کۆمەڵدا دەگەڵ یەکتری هەیانە ، ، هەر وەها ئەو قانۆنانە دەخاتە بەر چاو کە خۆیان بەسەر چالاکییەکانی ماڵێ ناو کۆمەڵدا دەسەپێنن و ئەو ڕێگایانەش پێشان دەدا کە پێدا ڕۆیشتنیان دەبێتە هۆی بەختیارێ ، پێشکەوتن و خۆشێ ژیانی میللەت . لە دنیای ئێمڕۆدا ئەم زانستە دۆ لکی گەورەی هەیە : ئیقتیصادی سۆسیالیستێ و ئیقتیصادی سەرمایەدارێ . پێرەوێ کردنی هەریەکێ لەم دوانە لە کاروباری وولاتێکدا شێوەیێکی تایبەتێ دەدا بە کۆمەڵ کە دەگەڵ ئەوێتریان بە تەواوێ جیاوازە .

**ئیقتیصادکردن** ــ [عا. کو.] ، (مصت. لا.) ١ــ دەست بە ماڵی خۆوەگرتن . ٢ــ کەم خەرج کردن ، دەس گێڕانەوە لە سەرف کردن . ٣ــ (مج.) خەرج و مەسرەفی بێهۆدە نەکردن ، پاشەکەوت کردن .

**ئیقتیصادێ** ــ [ عا. کو. ] ، (ص.) هەر شتێك یا کارێکی پێوەندێ بە ئیقتیصادەوە هەبێ . ٢ــ (مج.) هەر کارێ یا شتێکی ، لە کردن یا بە کارهێنانی قازانجی ماددێ چاوەڕوان بکرێ . :: ئوتۆمبێلێکی فۆلکس‌واگن بکڕە زۆر ئیقتیصادییە هەر بەنزێن سەرف ناکا .

**ئیقدام** ــ [ = عا : اقدام ] ، (نمص.) ١ــ ئازایەتێ ، دلێرێ ٢ــ نەترسان ، وێران ( فە. ) :: پیاوێکی بە ئیقدامە ، چ کەسی هێندە بێ ئیقدامم نەدیوە .

**ئیقدام‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، (مصت. لا.) ١ــ دەست‌بەکارێ‌کردن، پێ بەکارێکداکردن . ٢ــ ئازایەتێ و دلێرێ نواندن . :: ئەو ئیقدامەی ... کردی بە کەس ناکرێ .

**ئیقرار** ــ [ = عا : اقرار ] ، (نمص.) تە : ئیعتیڕاف . :: بە ئیقراری خۆی هێچێ لای شێرکۆ نەماوە .

**ئیقرار پێ‌کردن** ــ [عا. کو. ] ، ١ــ(مصت. لا.) تە: ئیعتیڕاف کردن. ٢ــ (مصت مت.) تە : ئیعتیڕاف پێکردن/٣ .

**ئیقرارکردن** ــ [ عا. کو. ] ، (مصت. لا.) تە : ئیعتیراف‌کردن .

**ئیقلیم** ــ [ یۆنانێ : کلیما ]، (نا.) ١ــ بەشێك لە زەوێ کە لە باری ئاووهەوا و چلۆنایەتێ تەبێعی دەگەڵ

بەشەکانی‌تر جیاوازیٚ هەبیٚ و ناوێکی تایبەتیشی هەبیٚ . جوغرافیٚ زانانی کۆن هەموٚ زۆی زەویٚیان بە حەوت ئیقلیم دانـاوە . ٢ـ وولاٚت . ٣ـ مەلبەند . :: ئیقلیمی رۆم ، ئیقلیمی شام ، ئیقلیمی کوردستان ، ئیقلیمی چوارەم .

**ئیقناع‌بۆن ـ** [ عا : اقناع + کو: بۆن] ، ( مصـ. لا. ) ١ـ قبوٚل کردنی بیروڕایەك دەربارەی مەسەلەیەك ، پاش ئەوەی لە لایەن کەسێکی ترەوە شیٚ دەکرێتەوە ، یان ئینسان خۆی بە بیری خۆیدا دەچێتەوە. ٢ـ ڕازی بۆن بەکردن یا نەکردنی کارێك . :: ئەوەندیٚ کردیٚ و کراندیٚ هەر ئیقناع نەبۆ . من چۆن بەو قسانە ئیقناع دەبم . بەلکوٚ تۆش هەولێکی دەگەل بدەی بۆ من ئیقناع نابیٚ .

**ئیقناع‌کردن ـ** [ عـا. کو. ] ، ( مصـ. متـ. ) ١ ـ ڕازیٚ‌کردنـی کەسیٚ بە قسە و بیروڕای خـۆ . ٢ـ پیٚ قبوٚل‌کردن . :: توانستێکی سەیری هـەیە لـە ئیقناع‌کردنا . ئیقنـاعم‌کردوە واز لە سـەفەرەکەی بێنیٚ . بۆی ئیقناع نەکرا .

**ئیکسیر ـ** (نـا.) ، ١ـ داو و دەرمانیٚ کە پێشـوٚنیان لایان وا بۆ (عناصر) دەگۆڕی ، وەك (مس بکا بە ئالتوٚن و ... ) ، ٢ـ (مجـ.) هەر شـتێکی کەم دەسـت کەویٚ . ☐ « ئیکسیرە خاك و خوٚلی دەرمالی گەورە مالاٚن » ( حاجیٚ ) . تێبـ ـ ئەم ووشـەیە لە ( کسـیریوٚن )ی یوٚنانیٚ‌ڕا خوازراوەتەوە بـۆ زمانی عەرەبیٚ و بۆتە ( الأکسـیر ) ، ئەو جار لە عەرەبیٚ‌ڕا خوازراوەتەوە بۆ زمانانی فرەنسیٚ و ئینگلیـسی و کراوە بە ( ئێلیکسیر ) .

**ئیکلام ـ** [ محر. عا : اکرام ] ، (نا.) ، (مکـ.) ڕەسـمی حورمەت ، ڕیٚ و ڕەسـمێکە بـۆ نیشـاندانی حورمەت و ڕێز بەرامبەر کەسـیٚ ئەنجـام دەدریٚ . تێبـ ـ دەسـت بەسـینگەوە دەگیـریٚ و بـە پێی گـەورەیی ئـەو کەسـە یا ئـەوان کەسانەی نیاز وایە ڕێزیان لیٚ‌بندریٚ، لای ژوٚرۆی لـەش بـۆ پێشـەوە دەچەمێنرێتەوە .

**ئیکلام‌کردن ـ** ( مصتـ. لا. ) ، (مکـ.) ڕەسمی حورمەت بەجیٚ‌هێنان. تەعزیم‌کردن . ★ ئیکلام کێشـان

**ئیکلام‌کێشان ـ** ( مصتـ. لا. ) ، (مکـ.) تە : ئیکلام‌کردن . ☐ «دەچوٚنە خزمەت مـام غەلێفەی ئیکـلامیان کێشاوە » ( تحفە : ج ٢ ـ ٧٧ ) .

**ئیکمال‌بۆن ـ** [عا : اکمال + کو : بۆن ] ، ( مصتـ. لا.) ، (کعر.) لـە ئیمتیحانا لە یەك یـا چەند دەرس دەرنەچۆن و نـاچار بـە ئیمتیحان دانەوەیان‌بۆن .

**ئیگرەم بیژرەم ـ** [ ئیگـرەم = ئیگرمیٚ (٢٠) + بیژ = بیش (٥) + رەم = درەم ] ، [ تو. کو. ] ، (نتـ.)، (کعر.) سەنگێکە بۆ کێشانی شت ، بەشێکە لە شازدە بەشی حۆقەیەك، بە حۆقەی سـلەیمانیٚ دەکاتە ٢٢٠ گرام .

**ئیلاقەکردن ـ** [ ئیلاقە = عا : علاقـە + کردن ] ، [ عا. کو. ] ، (مصتـ. متـ.) ١ـ دەسـت درێـژی

